# قازی محەممەد

(کوردستان لە ساڵەکانی ١٩٤٦-١٩٤١)

حەمیدرەزا جەلالی‌پوور

وەرگێڕانی لە فارسی‌یەوە: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی

١٣٨٤ هەتاوی

٢٠٠٦ زایینی

# ناوەرۆک



## بەشی یەکەم

## مەسەلە گشتییەکان

## بەشی دووەم
## قازی محەممەد و بارودۆخی سیاسی-کۆمەڵایەتی مەهاباد



## بەشی سێیەم
## قازی محەممەد و پێکهێنانی حیزبی دیموکرات وکۆماری خودموختاری مەهاباد

بابەت ........................................ لاپەڕە



## بەشی چوارەم

## ئەنجام گیریی

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی وەرگێر

کێشەی گەلی کورد وەک کێشەیەکی نەتەوەیی بۆ سالانی شەڕی یەکەمی جیهانی دەگەڕێتەوە، ئەوەبوو لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی یەکەم و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی بیرۆکەی دروست کردنی دەوڵەتی کوردی و قەوارەی سەربەخۆ سەری هەڵدا...چونکە گەلانی تری دەوڵەتی عوسمانی و بەتایبەتی میللەتانی دەورو بەرو هاوسنووری کورد مافی خۆیان جیاکردەوەو کوردیش بە مافی رەواو سروشتی خۆی زانی کەداوای ماڵجیایی بکات.پەیمانی سیڤەریش لە سالّی (۱۹۲۰ز)لەمادەی(٦٢)ی خۆیدا توانی مافە سیاسیەکانی کورد بـەلەمینی و بەرەسمی دانی پێدابنێ، بەمەش دەرفەتێکی لەبار بۆ کورد هاتە پێشەوە کەئەویش وەکو گەلانی تری ناوچەکە خاوەن حکومەتو کیانی خۆی بێت.

بەلام پەیمانی( لۆزان ) لە سالی (۱۹۲۳ز)دا خەونو خولیای کوردی بەدروستکردنی کیانی خۆی خنکاندو لەسەر حیسابی کورد دانینا بە حکومەتی تازەی کەمالیەکان لە تورکیادا.

بەلام کورد بۆ وەدەست هێنانی مافی رەوای خۆی و بۆئەوەی ئەویش وەک هەر گەلێکی تری برای خۆی بەئازادی و دوور لە جەورو ستەمو چەوسانەوە

لەناوچەکەدا ژیان بەردەوامبوو و مافی کەسایەتی پێشێل نەکرێت، لەهەوڵ و خەبات و تێکۆشانیدا هەر بەردەوام بووە و نەوەستاوە.

کورد لە شۆڕش و راپەرینەکانی خۆیدا دژی زوڵم و زۆری و پێشێلکاری مافەکانی جەنگاوە بۆ داکۆکیکردن لەسەر بوون و مانەوەی خۆی، بەگژ رژێمە ملهۆڕەکاندا چۆتەوە، نەک شۆڕشەکانی لەسەر حساب و دژ بە بەرژەوەندیەکانی گەلانی تر بوبێت.

بەڵام بەداخەوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت مامەڵەیەکی مەعقول و مەنتیقی یانە لەگەڵ کێشەی کورددا نەکراوە و هەمیشە شۆڕش و راپەرینەکانی کورد بەزەبری ناگروناسن وەڵام دراونەتەوە؛ هەر بۆیە ئێستا لەگەڵ پێنانە هەزارەی سێیەمی مرۆڤایەتی و سەردەمی بە ئیستیلاح مافی مرۆڤ و گەلان، کەچی هێشتا ئەو کێشەیە هەر باقی یەو بەچارەسەر نەکراوی ماوەتەوە.. شۆڕش و راپەرینەکانیش گەلێ زۆرن؛ لەوانە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودو قازی محەممەدو بارزانو... هتد. کە هەندێکیان تا ئاستی حوکمرانی و حوکمەت رۆیشتوون وەک حوکمەتی مەلیک مەحمود لە سلێمانی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، وە حکومەتی قازی محەممەد، واتە کۆماری کوردستان لە مەهاباد-کە بابەتی ئەم کتێبەی بەردەستە.

کۆماری کورد لە کوردستانی رۆژهەڵات(ئێران)دا، لە سانەوەختێکی پڕ لەجەنجاڵی دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانی هاتە ئاراوە، ئەو شەڕەی کە چەندین کارەسات و مەرگەساتی گەورەو بەڵاو نەهامەتی بۆ گەلان بەدواوە بوو، لەهەمان کاتا لێرەو لەوێ چەند هەلو مەرجێکی گونجاویشی بۆ گەلانی ژێر دەستە رەخساند کەیەکێک لەوان گەلی کورد بوو کە توانی ئەو کۆمارە

رابگەیەنیو بۆیەکەم جار ئاڵای کوردستانی بەسەردا بەرز بکاتەوە، کەدووەمین ئەزموونی حوکمڕانی کوردی بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی رابردوودا دوای ئەزموونی شێخ مەحموودی حەفید؛ راستە هاوکات لەگەڵ ویستی کورددا هۆکاری دەرەکیش کاریگەر بوو لەمەیدانەکەدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشا و ویڕای تەمەنی کورتی کۆمار، دەربڕی چەوساوەییو خەباتی دوورو درێژی گەلی کوردە لەرێی گەیشتن بەمافی رەواو نەتەوەیی خۆی و بایەخێکی مێژوویی زۆری هەیە بۆ کورد و پێویستە وەک ئەزموونێکی مێژوویی سوودی لێ وەربگیرێتو فەرامۆش نەکرێت لەلایەن رۆڵەکانی ئەم گەلەوەو شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی وردو بابەتیانە لەسەر جۆرو چۆنیەتی دامەزراندنی کۆمارەکەو تەمەنیو دەسکەوتەکانیو هۆکارەکانی رووخانیو هەروەها بایەخی مێژوویی‌و پەندو وانەکانیو کەسایەتی قازی محەممەد... بکرێت.

بێگومان کۆماری مەهاباد خاوەنی کۆمەڵێک تایبەتمەندی مێژوویی و دیاردەی سەردەمی خۆی بوو لەرووی فیکریو هۆشیاری وەک(هەلو مەرجو زەمینەی دامەزراندنیو بەشداریکردنی زۆربەی چینو توێژەکانی کوردستان لەوانەش زانایانی ئایینیو هاوبەشی و بەشداریکردنی کوردی پارچەکانیتر وەک کوردی کوردستانی عێراقو بارزانیەکان، وەپشت بەستن بە بێگانەو چەندەهایتر.

پێویستە لە هەموو ئەو لایەنانەو رووداوەکانی بەگشتی بکۆڵرێتەوە و توێژینەوە و شیکردنەوەی ورد و قووڵی لەسەر بکرێت و بکرێتە پەند و وانەی هۆشیاری بۆ رۆڵەکانی داهاتوو، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەملیۆنان مرۆڤەوە هەیە نەک بەشارێک و ناوچەیەکی دیاریکراو.

هەڵبەتە زۆر لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی جۆراوجۆر لەسەر ئەو کۆمارەوە لەکۆنو نوێدا ئەنجام دراون و لەزۆر گۆشەنیگای جیاوازەوە لەلایەن بێگانە و

غەیرە کوردەوە شت نووسراوە، پێویستە ئەو نووسین و توێژینەوانەش سوودیان لێ وەربگیرێت و بۆسەر زمانی زگماکی وەربگێردرێن، بەمەش مێژووی کورد زیاتر دەوڵەمەند و پڕ بایەختر دەبێتو تەنها لە بازنەیەکی بەرتەسکیان داخراودا نامێنێتەوە.

یەکێک لەو نووسینانەی لە مەڕ ئەم کۆماره و قازی محەممەدەوە نووسراوە، ئەم کتێبەی بەردەستە کە(حەمیدرەزا جەلائیپور)بەزمانی فارسی و بەناوی(قاضی محمد،کردستان در سالهای ١٣٢٠تا١٣٢٤) نووسیویەتی.

ئیمەش لەرێی وەرگێرانی ئەم بەرهەمەوە هیوا خوازین خزمەتێکمان بەو بوارە کردبێت و کەلێنێکیش لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە، گەرچی مەرجیش نییە لەگەڵ هەمـوو راو بۆچوونەکانی نووسەردا بین، بەڵام وەک ئەمانەتێکی زانستی بێدەستکاری وەرمان گێراوە و گەر بەپێویستمان زانیبێت لەهەندێک شوێنا تێبینیو سەرنجی خۆمـان دەربڕیوەو لەپەراوێزدا ئاماژەمان پێکردووە، هەروەها سالی زایینیمان لەبەرامبەر سالی کۆچی هەتاویدا داناوە.بەهیوای سوودی پێویست.

ئەحمەد وەرتی

هەولێر

١٢/٤/٢٠٠١ز

# پێشەکی نووسەر

ئەم لێکۆڵینەوەیە و ناوەڕۆکی بابەتەکانی کەپەیوەنـدی بـە مێـژووی سیاسـی کوردستانەوە هەیە، ئەنجامی ئەو بینین و توێژینەوانەی بەندەیـە بـە درێژایی ئـەو چوار ساڵەی مانەوەم لە شاری مەهاباددا، کـە هـەوڵـم داوە ئـەو بابـەت و بینینانـەم لەچوارچێوەی ئەم نووسینەدا کۆبکەمەوە.

لە کۆکردنەوەی ئەم نووسینەدا سوودێکی گـەلێـک زۆرم لـە ڕێنماییـەکـانی مامۆستای بەڕێز جـەنـابی دکتـۆر تاڵـب سـەرۆکی دەسـتەی هاریکـاری(گـروە تعاونی)کۆلێژی زانسته کۆمەڵایەتیـەکـانی زانکـۆی تـاران، وەرگرتـووە، چونکـە بەڕێزیان جارێـک کۆنووسـی ئـەم نووسـینەیـان زۆر بـە دیقـەت و تـارامی یـەوە خوێندەوەو چەند ڕەخنەو سەرنج و ڕێنمایی بەرەوتی و بنیاتەرانەیان پێشـنیار کـرد، منیش هەوڵم داوە لە کۆکردنـەوەی ئـەم نووسـینەدا بـەکاریـان بێـنم و کـەڵـکیان لێوەربگرم و ڕەچاویان بکەم.

بۆیە لێرەدا بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵەوە سوپاسی بەڕێزیان بکەم.

حەمیدڕەزا جەلائی‌پور

۱۳٦۷/۸/۲۰ هەتاوی

## ١- خستنەرووی بابەتەکە

هەوڵ دەدەم بابەتی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەم دوو خاڵەی خوارەوەدا روون بکەمەوە:

یەکەم/ لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی(١٩٤٦ز) لە شاری مەهاباد، کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان بە رێبەرایەتی قازی محەممەد پێکهات و بەشی باکوری ناوچە کوردنشینەکانی لە خۆگرت و دوای یازدە مانگ لەگەڵ هاتنی سوپای دەوڵەتی ئێران بۆ باکوری خۆرئاوای ئێران، سەرانی ئەو کۆمارە دەستگیر کران و رێبەرەکەی پاش سێ مانگ لە گیرانی، حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو و لە هەمان جێگادا کە کۆمارەکەی لێ راگەیاندبوو لە سێدارە درا.

لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی مێژووی سەد ساڵە ی ئێراندا، مێژوو نووسان، شوێنێکی تایبەتیان بۆ ئەم رووداوە دانەناوە، بەڵکو بە زۆری لە تەک رووداوەکانی ئازەربایجان و حیزبی دیموکراتدا هێناویانەتە بەر باس‌وخواس و بە کورتی یادیان کردۆتەوە و لێی دواون. بەڵام ئەم رووداوە(واتە کۆماری کوردستان)، لە مێژووی ئەم پەنجا ساڵەی دوایی کوردستاندا لە چەندین رووەوە زۆر جێی

گرنگی پێدانە و بایەخی خۆی هەیە لە زۆر لاوەش نەخش و ڕۆڵی بنەڕەتی بینیوە، چونکە:

ئێمە هەموومان لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، لەگەڵ شانۆی سیاسی کوردستان(لانیکەم لە بواری هەواڵ و دەنگ و باس دا) ئاشنایەتیمان هەیە و ئاگادارین.

یەکێک لە یاریکارانی ئەسڵی ئەم شانۆ سیاسییە حیزبی دیموکراتە، ئەم حیزبە یەکێ لە بە لگە و پاساوەکانی ڕەوایی خەبات و شۆڕشەکەی خۆی دژبە دەوڵەت بەم شێوەیە پوختە دەکاتەوە:

«حیزبی دیموکرات درێژە پێدەری ڕێگایەکە کە قازی محەممەد لە پێناویاسەری ناوەتەوە، ڕێگایەک کە ئازادی میللی، فەرهەنگی و سیاسی گەلی کوردی لە خۆ گرتووە و تیایدا بەرجەستە ئەبێت، ڕێگایەک کە گەلی کورد لە پێناوگەیشتن پێی هەرچی خەبات و خوێنی هەیە بە خەرجی داوە[١]».

بە دەربڕینێکیتر، ڕووداوی کۆماری ئۆتۆنۆمی کوردستان و بەسەرهاتی قازی محەممەد، هەم بەیانگەر و دەربڕی ڕێی حیزبی دیموکراتە و هەم نموونەو سەرمەشقی ئەو ڕێبە و شیرینترین و خۆشترین وشە و قسەی حیزبی دیموکرات بۆ خەڵکی کورد بەتایبەت لاوان ، باسکردنی هەمان ئەو ڕووداوەیە.

مەسەلەکە لێرەدا ئەوەیە کە بۆچی حیزبی دیموکرات ڕووداوێکی بە ئیستیلاح واگرنگ، ناخاتە بەر نوێژینەوە و لێکۆڵینەوە و بە دووڕو درێژی باسی ناکات و لە ڕووی مێژووییەوە ڕوونی ناکاتەوە، و تەنها وەک ئەفسانەیەکی مێژوویی باسی لێوە دەکات[٢]!

گرنگی نەدان و ئاماژەنەکردنی ڕێبەرانی حیزبی ناوبراو بەو مەسەلەیە - واتە بەشەرح و ڕاڤەی کەسایەتی و ئەو ڕێگایەی کە قازی محەممەد هەڵیبژارد- پرسیارێکە بیرو هۆشی نووسەری بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە .

حیزبێک کە لەوچەند ساڵەی دواییدا بە هۆی چالاکی گەلێکی بەرفراوانەوە هەوڵیداوە کە تۆکرو لایەنگر لەنێو خەڵکی کوردا دروستبکات و بۆ لای خۆی ڕایکێشێ و وەکو بنیانگوزار و دامەزرێنەر لە قازی محەممەد دواوەو ئەدوێ، بۆچی ڕووی ڕاستەقینەی ئەو کەسایەتیە کوردیەی لە پەناپەردەی نادیاریدا هێشتۆتەوە؟

بۆچی ڕێبازو سیاسەتەکانی ئەو کەسایەتیە شەرح و ڕاڤە ناکات؟ئەگەر قازی محەممەد سەرمەشق و تولگویە، بەڵگەو نیشانەکانی چین؟ ئایا بەتەنها باسکردنی ئەوەکە قازی محەممەد لە ڕێی خودموختاری کوردا کوژراوەو سەری ناوەتەوە بەسە؟

بێدەنگی حیزب و لێکۆڵینەوە و ڕاڤە نەکردنی ئەو ڕووداوە هەمیشەیی سەرەکی و بنەڕەتی بۆ ئاکامی ئەم توێژینەوەیە بووە و لەگەڵ هێنانە گۆڕی ئەم پرسیارەو بابە تی سەرەکی کە :«ئایا قازی محەممەد کێ بوو ،ڕێگا و ڕێبازەکەی چی بوو ،چ ڕێبازو ڕێ و شوێنێکی داهێناو بەرنامانەی کە لە دەورانی حکومەتەکەیدا پێرەوی لێ دەکردن چی بوون، و میکانیزمی کەیشتن پێیان چی بوو و چۆن ئەو ڕێ یەی پێوا یان دەست نیشان کرد؟» ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەخۆگرتووە.بۆیە ئامانجی گشتی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتی یە لە:

«ناساندن و لێکۆڵینەوەی کەسایەتی قازی محەممەد و چۆنیەتی پێکهێنانی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری مەهاباد بەپشت بەستن بە باری سیاسی-کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی».

**دووەم**/ رەنگە ئەو پرسیارە بە میشکی خوینەردا گوزەر بکات کە ئاخۆ هەر لەبنەڕەتدا چ پێویست بەوە دەکات کە ڕووداوی سەرەوە وەک بەشێک لە مێژووی سیاسی گەلی کورد و بەشێوەیەکی جوداو سەربەخۆ بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و قسە لە هەموو ڕەهەندەکانی بکرێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا وەرنەگیرێ کە لە شێوەی دوو پێشەکی و یەک ئەنجام گیریدا خراوەتە ڕوو. ئەم چەند دێرە بەڵگەکاری‌یە ناوەرۆک و ڕۆحی وتە و قسە و لێدوانەکانی حیزبی دیموکرات پێک دێنێت.

لە پێشەکی یەکەمدا، ژمارەیەک(بەتایبەت لەم سەد ساڵەی دوایی‌دا)هەوڵیان داوە وا لە خەڵکی کورد و میللەتی کورد بگەیەنن کە مێژوو، نەژاد، زمان و ئاینی میللەتی کورد، خاوەنی ناسنامەی تایبەتی سەربەخۆی خۆیەتی و هیچ پەیوەندیەکی بە مێژوو و زمان و... ئەواوی چین و نەوژادەکانی تری میللەتی ئێرانەوە نیە و گەلی کورد گەلێکی سەربەخۆ و جودان.

وەلە پێشەکی دووەمدا، هەمان ژمارە و خەڵک هەوڵیان داوە و ئەدەن وا لە خەڵکی کورد بگەیەنن کە کوردەکان بۆ بوژاندنەوە و زیندوو کردنەوە و سەربەخۆ بوونی مێژوویی، زمان و نەژادی خۆیان چەندە خەبات و تێکۆشانیان کردووە و چەندە خوێنیان بەخشیوە و قوربانیان پێشکەش کردووە.

دوای هێنانە گۆڕ و خستنەڕووی ئەم دوو پێشەکییە ، بەم شێوەیە ئەنجامگیری دەکەن و ناکامەکەی رادەگەیەنن کە کوردێکی ڕاستگۆ و دڵسۆزو ڕاستەقینە کەسێکە ئەم ڕێگا مێژوویی‌یە بگرێتەبەر و خەباتی خوێناوی گەلی کورد تا گەیشتن بەدوا قۆناغی مەبەست و ئامانجی سەرەکی درێژە پێبدات و ئەم بەئامانج گەیشتنەش لەوشەی (خودموختاری)دا پوختەنەکەنەوە...

لایەنگرانی ئەم بەڵگە کاری و بانگەشەیەی سەرەوە، هەروا لەراڤەکردنی ئەنجامگیریەکەیاندا لەیەک لایەنەوە - زیاد لە هەمووی- سوود لە کەسایەتی قازی محەممەد وەردەگرن و لەرروونکردنەوە کانی خۆیاندا چ بەشێوەی نووسین و چ بەدەمی قازی محەممەد وەک نموونە و سەرمەشقی ئەو رێگایە دەدەنە قەڵەم، واتە بە بۆچوونی ئەوان دڵسۆزترین کەس بۆ فەرهەنگ و خەڵکی کورد قازی محەممەدە، کە بۆنەوان لەو رێگایەدا گیانی خۆی کردە قوربانی[٣]. بۆیە سەرنج و تێبینی و لێکۆڵینەوەی ئەم بۆچوون و بەڵگەکاریە دەخوازێت کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەو رووداوە مێژووییە بکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر بکەین. هەڵبەتە ئامانج لەم نووسینەدا سەرنج و لێکۆڵینەوەیە لەسەر پێشەکی دوومی بۆچوون و بەڵگەکاری ناوبراو، وەلەم هەڵسەنگاندنەدا هەوڵ دراوە کە زیاتر گرنگی بەمەسەلەی قازی محەممەد و حیزب و حکومەتەکەی بدرێت[٤].

## ٢-ئامانجە گشتیو تایبەتیەکان

لە کاتی خستنەرووی بابەتەکەدا وتمان کە ئامانجی سێ رەکی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بریتییە لە :

«ناساندن و لێکۆڵینەوە لە کەسایەتی قازی محەممەد و جۆنیەتی پێکهێنانی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری مەهاباد بە پشتبەستن بە باری سیاسی ـ کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی».

بەڵام دەتوانین ئامانجە دیار و تایبەتیەکانی ئەم- خوێندنەوەیە بە کورتی بەم شێوەیەی خوارەوە خاڵبەند بکەین:

١- لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندیەکانی رووداوە سیاسیەکانی کوردستان کە لەوچەند دەهەیەی دواییدا روویانداوە.

٢- لێکۆڵینەوە لە بارەی قازی محەممەد و باروودۆخی سیاسی ـ کۆمەلایەتی مەهاباد.

٣- لێکۆڵینەوە لەوە کە ئاخۆ چۆن قازی محەممەد بوو بە پێشەوا .

٤- لێکۆڵینەوە لە بارەی کۆمەڵەی (ژێ، کاف) ەوە.

٥- لێکۆڵینەوە لە مەڕپەیوەندی قازی محەممەد لەگەڵ کۆمەڵەی ژێ،کافدا .

٦- لێکۆڵینەوە لەمەڕ پەیوەندی قازی محەممەد لەگەڵ دەوڵەتی شوورەوی(یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو) .

٧- لێکۆڵینەوە لەمەڕ چۆنیەتی پێکهێنانی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری کوردستان و چۆنیەتی رووخانی کۆمارەکە.

## ٣-مەبەست لەم خوێندنەوەیە

لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی کورتی نووسینەکان، بڵاوکراوەکان، وتارو لێدوانەکانی کەسانی ناسیۆنالیست و ماددیگەرای کورد، وادەردەکەوێت کە سەرانی رووداوە سیاسیەکانی کورد بەتایبەت حیزبی دیموکرات، هەوڵیان داوە بەچاوپۆشین لەراستیە مێژوویی‌یەکانی گەلی کورد و تەنانەت هەندێ جار بەهۆی بەلاڕێ دابردن و تێکدانی چەند بەشێکی ئەومێژووە، خەڵکی کورد بخەنەنێوپەردەی تاریکی و پەنهانی وەهاوەو لەبری راڵە و لێکدانەوەی حەقیقەتی ئەوڕووداوانە، بە وروژاندنی دروشم گەلێکی بەرواڵەت عاتیفی و شۆڕشگێری، لاوانی دڵپاک بۆلای خۆیان رابکێشن و پاشان لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا بەکاریان بێنن.

بۆیە بەپێویستم زانی کە لە ڕێی وروژاندنی چەند بەشێکی ئەم راستیانەوە بەتایبەت هە ندێ لەو رووداوو حەقیقەتانەی کە تا ئێستا کەمتر لێدوانیان لەسەر

کراوە، خزمەتێک بکەم و بەرۆشنی کۆمەکێک بە بیر و زەین و هۆشی بەتایبەت میللەتی کورد-پێشکەش بکەم و بیانخەمە بەر بەرچاو روونی بەوە،ئەم روونکردنەوەیەی ئاماژەم پێدا مەبەستی سەرەکی ئێمە لەم لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەیەدا پێک دێنێت.

## ٤- شێوازی لێکۆڵینەوەکە

لەو سۆنگەیەوە کە ئەو بابەتەی ئێمە لێی ئەدوێین و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین، لایەنی مێژوویی_کۆمەلآیەتی هەیە و رەهەند گەلێکی دیاردە مێژوویی‌یەکانە، هەروەها لەبەر ئەوەی کەئەم رووداوە رووداوێکی مێژوویی و دوبارە نەبووە وەیە، دەبێ زانیاری‌یە پەیوەندی‌دارەکان و بەڵگەنامە پەیوەستەکان پێیەوە، لەبەڵگەنامە مێژوویی‌یە لابەلاکان و یادەوەری و بیرەوەری ئەوکەسانە دەستبخەین کە خۆیان بەشدار بوونە تیایدا، یا خود لە ماجەرای رووداوەکان ئاگادارن و(شاهیدعەیانن)بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا سوود لە شێوازی‌بەهەرمەند بوون لەبەڵگەنامە و یادداشت و چاوپێکەوتنەکان ەوەرگیراوە.

## ٥-دۆخی کاتی و شوێنی رووداوەکان

هەر وەک گوتمان، چۆنیەتی دروست بوونی کەسایەتی سیاسی قازی محەممەد و چۆنیەتی پێکهاتنی حیزبی دیموکرات و سەرەنجام چۆنیەتی دروست بوون و پێکهاتنی حکومەتی کۆماری مەهاباد، لەو مەسەلە گرنگانەن کە بەندە نیازیەتی بیانخاتە بەر نەشتەری لێکۆڵینەوە و راڤەکردن، بەڵام پێویستە لێرەدا ئەو خاڵە وەبیربێنینەوە کە هەموو ئەو رووداوانەی سەرەوە لەمەودای زەمەنی ١٣٢٠ی هەتاوی(١٩٤١ ز)- واتە لەگەڵ دەسپێکردنی جەنگی جیهانی دووەم[٥]- تا ساڵی ١٣٢٦هەتاوی(١٩٤٧ز)لەمەهاباد روویانداوە، بەدەربڕینێکی تر ئەم لێکۆڵینەوەیە

گرنگترین و سەرەکی‌ترین رووداوە سیاسیەکانی ئەو شەش ساڵەی ناوچەی مەهاباد لەخۆ دەگرێت.

## ٦-پۆلێن کردنی بابەتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە

بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە و ئەم خوێندنەوەیەی بەردەست بەم شێوەیەی خوارەوە دەخەینەروو:

سەرەتا لەبەشی دووەمدا قازی محەممەد بەپێی بارو دۆخی سیاسی-کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی، ئەخەینە بەر توێژینەوە، ئینجا لەبەشی سێیەمدا دەچینە سەر چۆنیەتی دروست بوونی حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان. لەبەشی کۆتاییشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە دەخەینەروو.

# بەشی دووەم

## قازی محەممەد و بارودۆخی سیاسی-کۆمەڵایەتی مەهاباد

## ١- تایبەتمەندییەکانی رووداوە سیاسییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم

هەروەک دەزانین پشت بەستن بە ناسیۆنالیزم و دانی ریکخستنی سیاسی بە لای خەباتکردندا، دووتایبەتمەندی خەباتی نوێی گەلانی جۆربەجۆری جیهانەکە لە میژووی خەباتی رابردوویان جیای دەکاتەوە. بەتایبەت لەو چەند دەهەیەی دواییدا، خەباتی گەلان و میللەتانی خۆرهەلات و خۆرهەلاتی ناوەراست زیاتر کەوتبووە ژێر تەئسیر و کاریگەری ئەم دوو تایبەتمەندییەوە، ناوچە کوردنشینەکانیش وەکو بەشێکی گرنگ و هەستیار لەخۆرهەلاتی ناوەراستدا، لەو دوو تایبەتمەندییە خالی نەبووە.

ئەگەر لە میژووی سیاسی رابردووی ناوچە کوردنشینەکاندا شانۆی ئالوگۆری سیاسی لە گۆرەپانی کوردستاندا، عەشیرەتە کوردەکان خۆیان بووبن و بەدەست ئەوانەوە بووبێ، ئەوا لەم سەدەیەدا-بەتایبەت لە پەنجا سالی دوایبدا- ئیمە زیاتر-شایەتی رووداو و ئالوگۆرە سیاسی، و میللی و حیزبییەکانی کوردان لەگەڵ دەولەتاندا بووین. بەدەربرینێکی‌تر، ئیتر ئیمەشایەتی حوزوور و ئامادەیی کاریگەرانەی سەرۆک عەشیرەتەکان لە شانۆ جیاجیاکانی سیاسی ناوچە کە نین، بەلکو ئەمجارەیان شاهیدی ئامادەگی و هاتنە مەیدانی گرژ و ریکخراو گەلیکین کە بە ریکخستنە سیاسی و نیزامییەکانی خۆیان و بۆزیندوو کردنەوەی مەسەلە

میللی و نەژادی و فەرهەنگیەکانی کوردان، هاتـوونـەتـە نیوگـۆرەپـان و شـانۆی سیـاسـەت و خولّقینەری زۆر رووداوو ئاڵوگۆڕیش بوونە.

بـەشـێـوەیـەکـی گـشـتی لـە سـەرەتـای رووداوو پێشـهاتـە حیزبـی و ناسیۆنالیـستـیـەکان لەدەیەکانی دواییدا، ناوچەکوردنشینەکانی ئێمە شـایەتـی دوو رووداوی گەورەی سیاسی بووە لە نێوان سەرجەم رووداوە سیـاسـیەکـانی تـردا، کەئەم دوو رووداوە رۆڵی بنـەرەتـی (دایـک) یـان بینیـوە بـۆ هـەمـوو رووداوە کوردیەکانیتر. ئەم دوو رووداوە گەورەیەش بریتین لە:

**یەکەم/** رووداوی قازی محەممەد و حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ساڵـی ١٣٢٠ هەتاوی تا ١٣٢٦(١٩٤١-١٩٤٧ز) کەسەرەنجام سەری کێشا بۆ پێکهێنـان و دروسـتـکردنـی کۆمـاری کوردسـتـان لـە سـاڵـی ١٣٢٤(١٩٤٦ز) و لـە سـاڵـی ١٣٢٦(١٩٤٧ز) دا بە لەسێدارەدانی قازی محەممەد کۆتایی پێ هات .

**دووەم/** جـەرەیـانـی حیـزبـی دیمـوکـرات و حیزبـی کۆمـەڵـە لـەسـاڵـی ١٣٥٧هەتاوی(١٩٧٩ز) کەیەکێک لە توخمـە سـەرەکیـەکـانی شـانۆی سیاسـی ـ ئەمنیەتی ناوچە کورد نشینەکان لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیـسلامی ئێران پێک دێنێت. ئێمە لەم ـ نووسینەدا تەنها رووداوو جەرەیـانـی یـەکـەم دەخـەینـە بـەر تۆژینەوە و لیکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین .

بەڵام لەبەر ئەوەی کە شانۆ جوگرافیەکەی ئەم رووداوە سیاسیانە لە دەڤـەری مەهابادا بووە، بۆیە پێویـستـە بەرلەدرێژەدان بە باسەکەمان، کەمێک لەبارەی شـوێـن و مەوقیعیەتی مەهاباد بدوێین بۆ شارەزایی و ئاشنا بوونمان بەو شارە.

### ٢- مەوقیعیەتی مەهاباد

مەهاباد یەک لە شارستان(قەزاکان)ی پارێزگای ئازەربایجانی خۆرئاوایە لەباکوری رۆژئاوای ئێراندا. ئەم شارە بە بەراورد لەگەڵ هەمو ناوچە و شارە کوردنشینەکانی تری ئێراندا-واتە نیوەی پارێزگای ئازەربایجانی خۆرئاوا و پارێزگای کوردستان(سنە)و بەشێک لە پارێزگای باختەران(کرماشان)[1] -، بە یەکێک لە شارە کۆن و دێرینەکانی ناوچە کورد نشینەکان لەقەڵەم دەدرێت کە نزیکەی ٤٠٠ ساڵ بەسەر دروستبوونیدا رەت بووە.

گەر بێتو شاری مەهاباد لەگەڵ شارەکانی تری کوردستاندا بەراورد بکەین، دەبینین کە مەهاباد بەیەکێک لە سێ شاری ناوچە کورد نشینەکان لەئێران و بەیەکێک لە پێنج شاری کوردنشینی خۆرهەڵاتی نیوەراست(یان سەرزەمینی پێشووی ئێران) دێتە ژمار. چونکە وەک دەڵێن شارەکانی(سنە و سەقز و مەهاباد) لە ناوچە کوردنشینەکانی ئێران و شاری(سلیمانی) لە کوردستانی ئێراق و شاری(دیاربەکر) لە کوردستانی تورکیادا، نزیکەی چوارسەد ساڵێک لەمەوبەر پێک هاتوون، لە کاتێکدا سەرجەمی شارەکانی تری کوردستان کۆنی دێرینییان لەرووی بەشار بوونەوە بۆ سەدەی دوایی دەگەڕێتەوە[2].

سروشتییە کە سەرەتای دروستبوونی ئەو شارانەی سەرەوە بەتایبەت مەهاباد لەگەڵ جێگیربوونی بەشێک لەسەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکە دەستی پێکردووە و وردە وردە شێوەی شاری بەخۆوە گرتووە و سەقامگیر بووە.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین فاکتەری سەرەکیمانەوە و فراوان بوونی ئەم شارە لەچوار سەد ساڵی رابردوودا و تا جەنگی جیهانی یەکەم، لەم خاڵی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- شوێنی بەردەوامی جێگیربوونی سەرۆک عەشیرەتەکان.

٢- شـوێنی جێگیربـوونی بازرگـان و کاسـبکاران کـە پێداویسـتی و نیازمەندیەکانی دێهاتیەکان و عەشایەرو خەڵکی گشتی ناوچەکەیـان جێبەجـێ دەکردو لە ئەستۆی خۆیان دەگرت.

٣- رۆڵی بازرگانی ومامەڵەی ئەمشارە لـەنێوان شـارەکانی ئـازەر بایجـانی سۆڤیەتو ئەورێزو شارەکانی سلێمانیو ئەنانەت تورکیاش، وە دە تـوانین بڵـێین کە لەسەردەمی شەڕی دووەمی جیهانیودروستبوونی کۆماری مەهابـاددا، تـوێژە سەرەکیەکانی شار تەنها کاسبکارو بازرگانەکان بوون و لەڤۆناغی دواتردا خێزان و پێوەندداراني خاوەن سەرمایە و سەرانی عەشرەتەکان هاتنە ناویەوە.

هەروەها لە کرێسـتانەکان و لەوەرگاکانی دەورووبەری ئەم شارەدا یـاخود ئـەم شارستانەدا سێ عەشیرەتی مەنگوڕ، دەبۆکری و گـەورک دەژیـان. ئـەم شـارە لـە رابردووی خۆیدا شاهیدی ناکۆکی و ئیختیلاف گەلێکی جۆراوجـۆر لـە نێـوان خەڵکی کۆچەری و نیشتەجێکاندا بووە کە کۆمەڵناسە ئێرانیـەکـان باسـیان لێـوە کردووە.[٨]

## ٣- قازی محەممەد[٩] لە ساڵەکـانی ١٣٢٠(١٩٤١ز) دەیاخـود قـازی محەممەد چۆن بوو بە پێشەوا؟

سەرەتای دەستپێکردنی کاری قازی محەممـەد و چالاکیـەکانی لـە ساڵی ١٣٢٠ای هەتاوی لەهەمان شاری مەهاباد دەسـت پـێدەکـات و لـە خاکـەلێوەی ١٣٢٦(٣٠ی مارسی ١٩٤٧ز)بە لەسێدارەدانی کۆتایی پێدێت.

قازی محەممەد لەمیانەی ئەو شەش ساڵەدا و لەنێو هەل و مەرجی تایبەتـی ناوچە کوردنشینەکان- بەتایبەت لەناو شاری مەهاباددا-پێگەیشت و کەوتـە نـاو

کار و جم و جۆڵەوەو وەک زانایەکی ئایینی خەباتگێڕ و رابەری خەباتکاران و شۆڕشگێڕانی کورد و بنیاتنەری کۆماری مەهاباد ناوبانگی دەرکرد و ناسرا[١٠].

بەڵام ئایا بارودۆخی تایبەتی ئەو لەم شارەدا چی بوو؟

لەسەرەتاکانی شەڕی دووەمی جیهانیدا- واتە لەساڵی ١٣٢٠ھەتاوی (١٩٤١ز)- رووسەکان باکوری ئێران و ئینگلیزەکان باشوری وڵاتی ئێمەیان داگیرکرد.

دوانیوەڕۆی رۆژی ٥ی/ی خەرمانانی ١٣٢٠ھەتاوی(١٩٤١ز)لەدرێژەی داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزە ئیزامیەکانی سۆڤیەت(روسیا)، شاری مەهاباد بە فڕۆکەی رووسی بۆمباران دەکرێت و رۆژی دواتر لەمێو ترس و لەرز و دڵەڕاوکێی خەڵکیدا، هێزەکانی نیزامی شۆرەوی(روسیا)دەچنە ناو شارەکەوە، پادگانی مەهاباد کە بە بێ هیچ بەرهەڵستی و بەرگرییەک خۆی دابوو بە دەستەوە، دەست بەسەر دانەکرن و داگیریدەکەن، ومئەم داگیرکردنە تا مانگی گەلاڕێزانی ١٣٢٥ھەتاوی(نۆڤەمبەری١٩٤٦ز)بەردەوام دەبێت[١١].

بە دەربڕینێکی دیکە دەتوانین بڵێین کە ماوەی شەش ساڵ هێزەکانی دەوڵەتی ئێران لەو ناوچەیەدا حوزووریان نەبووە، و تا هاتنی سوپای(ئەرتەشی)ئێران. لەو ناوچەیەدا هیچ نەزم و ئەمنیەتێکی حکومی لەئارادا نەبووە، یانی لەو شەش ساڵەدا لەلایەکەوە دەوڵەتی ناوەندی هیچ جۆرە ئامادەگییەکی لە ناوچەکانی کوردنشیندا نەبووە و لە لایەکی تریشەوە سوپای بێگانە فەرمانڕەوا بووە.

لە خەرمانانی١٣٢٠ھەتاوی(١٩٤١ز)بەدواوە لە شاری مەهابادا ئەو کەسانەی کە خاوەنی سەرروەت و سامان و پلە و مەقامێک بوون، شارەکە بەجێ دێڵن و بۆ پاراستنی گیانی خۆیان بۆ شارە ئارامەکان لە ناوخۆی وڵات کۆچ دەکەن، یان پەنا

دەبەنە بەر ماڵ و دەغەری گوندەکانی ناوچە کوردنشینەکان و عەشایەری ئەو ناوچانە.

لەو نیوەندەدا تەنها خەڵکانی ئاسایی کە دەستیان بە جیگا و ڕێگایەک نەدەگەیشت لە شارەکەدا مانەوە، ئەو خەڵکە لەلایەک ترسیان لە هێزە نیزامیەکانی بیگانە هەبوو کە لە ناوچەکەدا بوون[١٢]، و لە لایەکی دیکەشەوە لە هێرش و پەلاماری چاوەڕوانکراوی بەشێک لە عەشایەر بۆ سەر شارەکە لە نیگەرانی و ترس و لەرزدا ژیانیان بەسەر دەبرد.

ئاڵەو بار و دۆخ و کاتانەدایە کە قازی محەممەد وەک مامۆستا و مەلایەک کە باوکی قازی ئاینی شار بووە، قۆڵی هەوڵ و هیممەت لێ هەڵدەماڵێ و دەست لە کار و باری خەڵکی وەرئەدات و ئێکەڵاوی گیروگرفت و ئیشوکاریان دەبێت.

قازی محەممەد لەو کاتەدا ژمارەیەک لە خەڵکی شارەکە ئامادە ئەکات و داروغەمچی و پاشان چەکیان پێئەدات تا لە بەرامبەر دەست درێژی و دزی و خراپەکاریدا پاریزگاری و پاسەوانی لە شارەکە بکات.

ئەو هەروەها کێشە و مەسەلە پەیوەندیدارەکان بەئازووقە و خۆراکی خەڵکی لەگەڵ کارمەند و بەرپرسانی ناوچەی شارەکەیدا چارەسەر دەکات و ڕێگا چارەیان بۆ دەبینێتەوە و بە پێکهێنانی دادگایەک و دامەزرانی وەک سەرۆکی دادگاکە، کێشە و ناکۆکی و گیروگرفتەکانی نێوان خەڵکی چارەسەر دەکات، هەر بە هۆی ئەو هەنگاوانەشەوە قازی محەممەد جێی خۆی لە دڵی خەڵکیدا دەکاتەوە و دەبێتە خۆشەویستی خەڵک و نازناوی پێشەوای پێ دەبەخشن[١٣].

لێرەدا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی قازی لە کاروباری ئەمنیەتی شاردا(ئەمن و ئاسایشی خەڵکیدا) ئاماژە بە دوو خاڵ دەکەین:

یەکەم/ لە کتێبی (از مهاباد خونین تا کرانەهای ارس) لە مەهابادی خوێناوییەوە تا کەنارەکانی ئاراس، نووسراوی (نەجەفقولی پەسیان)- پەیامنێری ئەو کاتی رۆژنامەی ئیتلاعات- کە لەو دەمەدا لە شانۆی سیاسی کوردستان و ئازەربایجانی رۆژئاوادا حوزووری بووە، بەم شێوەیە هاتووە: «قازی محەممەد لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا بە ڕێ و شوێن و شێوازی تایبەتی خۆی هەڵسوکەوتی دەکرد، چونکە ڕێگەی نەدا کاری کوشتن و پەلامارادان و دەستدرێژی لەنێو شاردا روو بدات یاخود سەروەت و سامانی خەڵکی بەتاڵانی بچێت، ئەم کارە وای کرد کە لە ماوەی دوو ساڵی دەسەڵاتداری و فەرمانڕەوایی ئەودا تەنها یەک کەس لە خەڵکی شار بکوژرێت* و خەڵکی هۆگریەکی تایبەت لەگەڵ قازیدا پەیدا بکەن».

دووەم/ عەشایەر بەهۆی ئەو رۆشنبیری و تێگەیشتنە تایبەتە عەشایەرییەی هەیانبوو و بەهۆی ئەو بەرخورد و تێکهەڵچوونانەی لەمەندێ بڕگەی مێژوویی‌دا لەنێوان ئەو عەشایەر و خەڵکی مەهاباددا روویاندا بوو و هەروەها بەهۆی چەند فاکتەرێکی‌تر کە هێشتا ڕوشن نین، زۆربەیان بە چاوێکی دوژمنکارانەوە سەیری ئەو شارەیان دەکرد و لە هەر دەرفەتێکدا کە بۆیان ڕێکەوتبایە، هەرچی لە توانایاندا با دەرهەق بەو شارە دەیانکرد و دریخی‌یان نەدەکرد، بە مانایەکی‌تر ئێمە لە ناوچەی مەهاباددا شاهیدی هەمان ئەو بابەت ومەسەلە و هەمان ئەو شتەین کە کۆمەڵناس(مردم شناس)انی ئێران باسی دەکەن کە بریتی‌یە لە ناکۆکی و جیاوازی کۆچەری لە گەڵ شارنشین یان نیشتەجێ‌یاندا...

بۆ نموونە قادر مودەریسی دەڵێت:

وله خەرمانانی ١٣٢٠هەتاوی(١٩٤١ز) کە هێزەکانی شۆڕەوی دێنە ناو خاکی ئێرانەوە و حکومەت لە ناوچەکەدا نامێنێ و بۆشاییی درووست دەبێت. سەرلەنوێ عەشیرەتەکان خۆیان چەکدار و ئامادە ئەکەن، هەمیشە لە بیری ئەوەدا ئەبن کە لە هەلێکی گونجاودا هێرش بکەنە سەر شاری مەهاباد. جێی سەرنجە کە بەپێی گەواهیەکان(شاهیدانی زیندوو)، لەو سەردەمەدا لە کاتێکدا کە هێشتا عەشایەر هەر لە گوندەکان و دێهاتی خۆیان ئەبن، کە بڕیار ئەدەن کاتێک هێرشیان کردە سەر شارەکە سەروەت و سامانی(میرزا رەحمەت شافیعی)- کە ناودارترین و دەوڵەمەندترین کەسی مەهاباد بوو- بە فلان بنەماڵە بدەن. کە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئاژاوەنانە وە و درووستکردنی ترس و بیم و لەرزێکی زۆر لە نێوخەڵکی مەهاباددا. ئالەو کات و ساتەدا، قازی محەممەد کۆمەڵێک کەس لە خەڵکی بەدار و گۆچان و کۆمەڵێکیش بە تفەنگ و خەنجەر چەکدار دەکات و سەرقاڵی بەرگریکردن و پارێزگاریکردن لە شار و جەماوەرەکەی دەبێت و ئەوپەڕی هەوڵ و توانا و تەقەلای خۆی لەو پێناوەدا دەخاتە گەڕ، وەبەم شێوەیە لە دڵی خەڵکی شارەکەدا خۆشەویست دەبێت[١٤].

## ٤- کۆمەڵەی(ژێ،کاف)و جەرەیانی سیاسی-رۆشنبیری لەتەک جووڵانەوەی قازی محەممەددا

هەروەها لە ئان و ساتی هەمان ئەو شەش ساڵەدا ژمارەیەک لە کوردەکان بە سەرنجدان لەو کارەسات و ناهەموار و ناسۆرییانەی بەدرێژایی مێژوو رووبەرووی ئەو میللەتە بوونەتەوە(بەتایبەت لە شەڕی جیهانیتران بەدواوە)[١٥] و هەمیشە دەوڵەتان و رووداوو ئاڵوگۆڕە سیاسیەکان وەک وەسیلە و ئامرازێک سوودیان لێوەرگرتوون، بیریان لە چارەسەرێک کردەوە و لەدرێژەی هەمان

چـارەسـەر و گـەران بـە دوای رێگـاچـارەیـەکـدا بـوو کـە لـە ساڵـی ١٣٢٠هەتاوی(١٩٤١ز)[١٦] بەدواوە هەر لە مەهابادا کۆمەڵەیەکی میللی-ئایینی لـە ژێر ناونیشانی کۆمەڵەی(ژێ.کاف)دا –زەمینەی پێکهێنانی فەراهەم هات[١٧].

ئەم کۆمەڵەیە کە پێشتر لە کوردستانی عیراقدا دروست ببوو[١٨]، باوەری بـە رزگاری گەلی کورد هەبوو(هەر بۆیەش هـەنـدێک کـەس دروسـتبـوونی ئـەم کۆمەڵەیە دەگێرنەوە بۆ ئینگلیز، چونکە ئەو کاتە ئینگلیز لەسـەرانـسـەری عیـراقدا خاوەن دەسەڵات و نفوز بوو)، وەهەروەها کۆمەڵە لـەو بـاوەرەدا بـوو کـە تـاکـە رێگای رزگار بوون و ئازادی میللەتی کورد گەشەکردن و بەرەوپێشـەوە چـوونی فەرهەنگ و رۆشنبیری ئەو میللەتەیە.

یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە کە تا ئێـستاش هەرلە ژیاندایـە دەڵـێ: ئەم کۆمەڵەیە هەر لە بنەرەتدا باوەری بە خـەبـاتی چـەکدارانـە نـەبـوو، بـەڵکو کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی-ئایینی بوو کە پێ ی وابوو دەبێ گەلی کـورد لـە رێگـەی هوشیاری و بەرەو سەربردن و گەشەپێدانی ئاستی فەرهەنـگ و رۆشـنبیرییـەوە رزگار بکرێت.

کۆمەڵەی(ژێ.کاف)سێ ساڵ بە شێوەی نهێنی کاری دەکرد بە پێی ئەو داب و مەرجە مەعنەوی و تایبەتیانەی خۆی کە هەیبوو[١٩] لە ناوچەی موکریاندا-واتە لە هەمان ناوچەی مەهاباد یان باشووری پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوای ئێستا-، بەڵێ کۆمەڵەی ناوبراو لەو ناوچەیەدا خەریکی کار و چالاکی خۆی بووە، بـەڵام ئەوەی کە جێی سـەرنجە لێرەدا ئەوەیە کە قازی محەممەد ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە نەبووە!

بە درێژایی ماوەی ئەو سێ ساڵە، کۆمەڵە توانی ژمارەیـەکـی زۆری خـەڵـک بەشێوەی تیپ و دەستەی نهێنی بەلای خۆیدا رابکێشێ و دەڵێن جـەم و جـۆڵ و

چالاکی ئەو کۆمەڵەیە کاریگەری زۆری لە سەر خەڵکی دروستکردوو کاری تێکردن. تا بە چەشنێک خەڵک و جەماوەرەکە خۆشیان دەویست و دڵیان پێوەی بەستابۆوەو هۆگری بوون، تەنانەت وەک دەڵێن شەوانە خەڵک تا بەیانی دەرگای ماڵەکانیان لە سەرپشت بەجێ دەهێشت بۆ هاتووچۆی کۆمەڵەکە.

جا نیستا بۆ ئەوەی لە بارەی وەزعی کۆمەڵەی(ژێ.کاف)و پەیوەندی بە قازی محەممەدەوە زیاتر ئاشنا بیت، دەقی قسەکانی محەممەدی سەمەدی لێکۆڵەرەوەی مێژووی مەهاباد و وەرگێری کتێبی(جمهوری مهاباد)، دەنووسم:

«لە ساڵی ١٣١٩هەتاوی(١٩٤٠ز)دا زانایەکی بروادار و دڵسۆز بە نێوی مەلا ئەحمەدی فەوزی کە بە مەلای سلێمانی بەناوبانگ بوو(سلێمانی یەکێک لە شارە گەورەکانی کوردستانی عێراقە)، کۆڕ و ئەنجومەنێک پێکدێنێت کە تیایدا وانەی ئیمان و ئەخلاق و هەندێکیش وانەی نەتەوایەتی بە قوتابیەکان دەڵێتەوە. ئەو ئەنجومەنە(محفل)ە هیچ جۆرە چوارچێوەیەکی دیاری کراوی ڕێکخستن و پەیڕەو و پرۆگرام و مەرامنامەیەکی نەبووە...بەڵام ئەوانەی کە لەو ئەنجومەنەدا بەشداریان کردوو لە کۆڕی ئەو زانایەدا سوودمەند و بەهرەمەند بوون، دواتر کۆمەڵەی(ژێ.کاف)یان دروست کرد.

کۆمەڵەی ناوبراو لە کوردستانی ئێراندا ڕۆژی ٢٥ گەلاوێژی ١٣٢١هەتاوی(١٦ی ئووتی١٩٤٢ز)بە ئامادەبوونی هەژدە کەس-شازدەیان مەهابادی و دوو کەسیان کوردی عێراقی[٢٠]-لە مەهاباد پێک هات. ئەو کۆمەڵەیە کە کۆمەڵەیەکی ئایینی-میللی بوو و تەنها لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی گەلی کورددا تەقەللاو خەباتی بەرفراوان و هەمەلایەنەی دە کرد، یەکەمین بزوتنەوەی سیاسی یە کە لە کوردستانی ئێراندا پێک هاتبێت.

بە پێویستی دەزانم لێرەدا ئەوە روون بکەمەوە کە رۆژی٢٥ی گەلاوێژ- هەروەک باسمان کرد- رۆژی لە دایک بوونی کۆمەڵەی(ژ.ک.کاف)ە کە هیچ پەیوەندیەکی بە حیزبی دیموکراتەوە نییە، بەڵام هەروەک دمزانین حیزبی دیموکرات خۆی بە پاشماوەی کۆمەڵەی(ژ.ک.کاف)دەزانێت و رۆژی دامەزراندنی هەردووکیان هەربەهەمان رۆژی ٢٥ی گەلاوێژ دەداتە قەڵەم[٢١].

ئەم کۆمەڵەیە لە یەکەمین هەنگاوە سەرەتاییەکانی خۆیدا، پەیوەندی لەگەڵ حیزبی (هیوا) لە کوردستانی عێراقدا پەیدا دەکات کە رێکخراوێکی شۆرشگێر و خاوەن ئەزموون بوو، وە لەلایەن حیزبی ناوبراوەوە چەند نوێنەرێک دەنێردرێتە مەهاباد بۆ رێکخستن و رێنمایی کردنی (ژ.ک.کاف).

لە هە مان ساتدا کوردەکانی تورکیاش چەند رێکخراوێکیان پێکهێنابوو کە لە سەرووبانەوە رێکخراوی(خۆیبی بوون) بوو، کە لە(بەیروت)و(پاریس)دا نووسینگە و نوێنەری هەبوو و دەنگ و باسی کوردستانی بە کەناڵ و دەزگاکانی راگەیاندنی جیهان دەگەیاند و بلاو دەکردەوە.

ئەم رێکخراوەش لەگەڵ حیزبی(هیوا) و کۆمەڵەی(ژ.ک.کاف)پەیوەندی بەستبوو. (ژ.ک.کاف، بە مانای کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان یا خود کۆمەڵەی تێکۆشەر لەپێناو ژیاندنەوە و نوێ کردنەوەی ژیانی کوردستان)...

کۆمەڵەی(ژ.ک.کاف)بۆ ئەندام بوون تیایدا، چەند مەرجێکی دانابوو و هەرکەسێک داوای ئەندامێتی کردبا، دەبوایە ئەو شەش مەرجەی جێبەجێ بکردایە، کە بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:

١- هەرگیز خیانەت لە کورد نەکات.

٢- بۆ خودموختاری کوردستان تێکۆشان نەوەستێت.

٣- هیچ رازێکی رێکخراوە، نەبە قەڵەم، نەبە ئیشارە نەدرکێنێت.

٤- هەتا کۆتایی ژیانی ئەندامی کۆمەڵە بێت.
٥- ئەواوی پیاوانی کورد بە برای خۆی و تەواوی ژنانی کورد بـە خوشـکی خۆی بزانێ.
٦- بە بێ ئیزنـی کۆمـەڵـەی(ژێ.کـاف) نـەبێتـە ئـەنـدامی هـیچ حیـزب و ڕێکخراوەیەکی تر.»

## بەڵام سەبارەت بە پێـوەنـدی کۆمـەڵـەی(ژێ.کـاف)بـە قـازی محەممەدەوە

تاکە بەڵگە نامەیەک کە لەو سـەردەمەدا دەتوانین پشتی پێ ببەسـتین ڕاو نەزەر و بۆچوونی مەلا قادر مودەڕیسی یە کە یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵـەیـە بووە و حاڵی حازر لە ژیاندایە و لە تەمەنی٩٧ساڵی یە.
لەو بارەوە سـەیید محەممەدی سـەمەدی لێکۆڵەر و وەرگێری کتێبـی کۆمـاری مەهاباد بەم شێوەیە ئەدوێت و دەڵێ:
«ئـەو( واتـە مـەلا قـادری مـودەڕیســی ) کـەســێکی بیرتیـژ و خـاوەن حـافیزە(لـەبیربـوون)ێکـی لـەڕادەبـەدەر بـاش و بـە هێـزە.مـەلا قـادر لـە دامەزرێنەرانی کۆمەڵـەی(ژێ.کـاف)بـووە و لـە مـەڕ ڕوونکردنـەوەی ئـەو مەسەلانەوە کە پێوەندییان بەو کۆمەڵەیـەوە هـەیـە ڕاسـتگۆیانە ئـەدوێـت و قسەدەکات.
بە گـوێرەی لێدوانـەکـانی نـاوبراو. قـازی محـەممـەد لـە دامـەزرێنـەرانـی کۆمەڵەی(ژێ.کاف) نەبووە. بەڵکو تەنها بەڵێنی ئەوەی دابـوو کـە هاوکـاری کۆمەڵە بکات و هاوکاریشی کرد. نازناوی خوالێخۆشبوو قازی محەممەد لـە کۆمەڵەی(ژێ.کاف)دا (بینایی)بوو. قازی بـۆ ئـەنـدامێتی لـە نـاو کۆمـەڵـەدا

بانگهێشت کرا و شوێنی بانگهێشت کردنەکەشی ماڵی خوالێخۆشبوو مام نەحمەدی نیلاهی بوو(کە دواتر لە حکومەتی قازیدا بوو بە وەزیری ئابووری)، لەوێ دووکەس لە ژوورێکی نهێنیدا قسەیان لە گەڵ قازی کرد و داوایان لێکرد بچێ ناو کۆمەڵەوە. ئەو دوو کەسەش یەکیان بەڕێز مەلا قادر مودەڕڕیسی و ئەوەیتریان خوالێخۆشبوو قاسم قادری بوو.

قازی لای ئەو دوو کەسە رایگەیاند کە ئامادەم هەر کارێک و هەر یارمەتی و کۆمەکیەک کە بۆ کۆمەڵەکە لە دەستم بێت راستگۆیانە و دڵسۆزانە ئەنجامی بدەم، بەڵام بەشێوەی رەسمی نابمە ئەندام، واتە نەبە رەسمی بوو بەئەندام و نە سوێندیشی خوارد، بەڵام بە شێوازی لابەلا و ناراستەوخۆ هاوکاری کۆمەڵەی دەکرد.» (لە بەڕێز سەید محەممەدی سەمەدی نەقڵ کراوە کە لێکۆڵەرەوە، وەرگێڕی کتێبی کۆماری مەهابادی ئەنگلتۆنە)[۲۲].

له ساڵی ١٣٢٤هەتاوی(١٩٤٥ز)، واته چوار ساڵ دوای داگیرکردنی شاری مەهاباد له لایەن هێزەکانی سۆڤیەت(روسیا)وە، ئێمە شاهیدی دوو رووداوی گرنگی سیاسین لـه ناوچـەکـەدا؛ یـەکیان دامەزراندنی حیزبی دیموکراتـه بـه سەرکردایەتی گشتی قازی محەممەد و ئـەوی تریـان دروستکـردن و پێکهێنانی کۆماری خودموختاری مەهاباده ئەمیشیان هەر بەسەرکۆماریەتی قازی محەممەد. ئێستاش بـەر لـەوەی بچینـه سـەر روونکردنـەوەی ئـەم دوو رووداوه و شرۆڤەکردنیان، پێویسته ئاماژه به هەردوو سەفەری قازی محەممەد بـۆ سۆڤیەت بکەین کەلە ماوەی ئەو چوارساڵەدا بەئەنجام گەیشتوون.

## ١-سەفەری یەکەم بۆ سۆڤیەت

سەفەری یەکەم، له ساڵی ١٣٢٠هەتاوی(١٩٤١ز)دەبێت، که چەند نوێنەرێـک له کوردستانی ئێرانەوه به مەبەستی دیدار و چاوپێکەوتـن لـه یـەکێتی سۆڤیەت دیاری دەکرێن و لەلایەن سۆڤیەتەکانەوه بانگهێشت دەکرێن.

ئەو بانگهێشت(دەعوەت)ه له لایەن نوێنەرانی کوردەوه _که زیاتر له بیست کەس[٣٣] بوونه_قەبـووڵ دەکرێـت، میوانـەکـان لـەرێگـەی تـەوریـز و بـەمـەوی شەمەندەفەرەوه بەهاوڕێیەتی ژەنەراڵ سەلیم ئاتاکشیوف دەگەنه باکۆ.

ئەو هەیئەتە(شاندەکە) لە باکۆ جاویان بە پیشکەوتنەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵی، فەرهەنگی و هونەرییەکان کەوت و لەگەڵ سەرانی کۆماری نازەربایجانی سۆڤیەتدا لەمەڕ کوردستانەوە، چەند وتوویژێکیان ئەنجامدا. لەو سەفەرەدا میرجەعفەر باقرۆف، سەرۆک کۆماری نازەربایجانی سۆڤیەت روو بە شاندی کوردان دەڵێ:

«ئێمە ئێوەمان خۆش دەوێت و بۆ سەربەرزی و بەرەو پێشچوونی گەلی کورد تێدەکۆشین، وە ئێوە هەر کارێکتان هەبوو سەردانمان بکەن و پێمان بڵێن، بڵێن بەراستی بزانین چ داواکاریەکتان لە ئێمە هەیە».

قازی محەممەدیش لە وەڵامی ئەو قسەیەی سەرکۆماری سۆڤیەتیدا دەڵێت:

«ئێمە سەربەخۆییمان دەوێت و پێویستە دەوڵەتی سۆڤیەت بە هۆی سوپای سوورەوە سەربەخۆییمان دەستەبەر بکات و چەکمان پێبدات...».

هەڵبەتە لەو سەفەرەدا چەند جیاوازی و ناکۆکیەک لە نێوان خودی نوێنەرانی کورددا روویدا- چونکە هەیئەتەکە هەم لە سەرۆک عەشیرەتەکان پێک هاتبوو هەمیش لە کەسانی سیاسی...!

## ٢-سەفەری دووەم بۆ سۆڤیەت

سەفەری دووەم، لە خەرمانانی ١٣٢٤هەتاوی(سیپتەمبەری ١٩٤٥ز)دا بەئەنجام گەیشت، کاتێک ژەنەراڵ سەلیم ئاتاکشیۆف نوێنەری سیاسی سۆڤیەت لە ئازەربایجان، داوا لە قازی محەممەد دەکات کە هاوڕێ لەگەڵ هەیئەت(شاند)ێک سەردانی سۆڤیەت بکات. لەو سەفەرەدا حەوت کەس هاوڕێیەتی قازی محەممەدیان کرد(کە زۆربەیان لە کەسانی سیاسی بوون)[21].

ئەم شاندە لە وتـەکەی شەمەندەفەری باکۆدا لەلایـەن نوێنـەرانـی کۆمـاری ئازەربایجانەوە پیشوازی کران و پاشان وت و وێـژ و دانوسـتان بـە ئامـادەبـوونی (جەعفەر باقرۆف) سەر کۆماری ئازەربایجان و شاندی نـاوبراو، دەسـتی پێکـرد. لەو وت و وێژ و کۆبوونەوەیەدا باقرۆف لە حاڵێکدا بەناوڵەپـی دەسـتی، دەسـتی خۆی لە دەسکی ئەو کورسیە گیر کردبوو کە لە سەری دانیشتبوو، وتی:

«... تا رۆژێک کە کۆماری سۆشیالیـستی هەیە، خودموختاری و ئازادی گەلی کوردیش بەرقەرارە...»[25].

قازی محەممەدیش لە وەڵامیا وتی:

«گەلی سەدەیدەی کورد هەردەستێک کە رابێن بە پارمەتیـدان و هاوکـاری کردنی، نەک هەر دەیگوشێت، بەڵکو ماچیشی دەکات...»

هەروەها لەو سەفەرەدا باقرۆف بەڵێنی ئەم شتانەی خوارەوش بە شاندەکە ئەدات:

١- چەک و چۆڵ و یارمەتیـەکـانی تـری کـاڵا و کـەل و پـەل بـۆ مـەهابـاد بنێردرێت.

٢- قازی محەممەد کۆمەڵێک لاوی کورد بنێرێت بۆ زانکۆی نەفـەری باکۆ بۆ بەشداری کردن لە خولی مەشقی سـەربـازی(کـە دواتـر هـەشـتا کـەس نێردران).

٣- دەزگایەکی ماشینی چاپکردنی کتێب و رۆژنامە بنێرێت بە کوردان[31].

## ٣-پێک هاتنی حیزبی دیموکرات

دروستبوونی حیزبی دیموکرات، دوای سەفەری دووەم بۆ سۆڤیـەت بـوو، ئەوەبوو کە قازی محەممەد دوای ئاگادار کردنەوەی کەسانی بنەڕەتی و سەرەکـی کۆمەڵەی(ژ.ک،کاف)، دروست بوونی حیزبی دیمـوکراتی کوردسـتان وەک تـاقـە

ڕێکخراوی سیاسی ناوچە کوردنشینەکان ڕاگەیاند و کۆمەڵەی(ژێ.کاف)یش لەگەڵ ئەو حیزبەدا تێکهەڵکێش بوو.

دوابەدوای ئەمە یەکەمین کۆنفرانسی حیزب لە سەرماوەزی ١٣٢٤هەتاوی(تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ز) بۆ پەسەند کردنی بەیرەو و پرۆگرام و هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی و سکرتێری گشتی، بەسترا و قازی محەممەد بە سکرتێری گشتی ئەو حیزبە هەڵبژێردرا.

هەندێک لە خاڵەکانی بەرنامەی ئەو حیزبە بریتی بوون لە:

١- گەلی کورد لە ناوخۆی ئێراندا لە بەڕێوەبردنی کار و باری خۆی ئازاد و سەربەست بێت و خودموختاری خۆی لە چوارچێوەی ئێراندا بەدەستەوە بگرێت.

٢- بتوانن بە زمانی کوردی خۆی بخوێنن و ئەوزمانە بە ڕەسمی بناسرێت.

٣- ئەنجومەنی هەرێمی‌ی کوردستان بە پێی یاسای بنەڕەتی(قانون اساسی) بە زووترین کات هەڵبژێردرێت و لە هەموو کاروبارە کۆمەڵایەتی و دەوڵەتیەکاندا چاودێری و سەرپەرشتی بکات.

٤- بەرپرسانی دەوڵەتی لە ناوچەکەدا، بە تەنکید دەبێ لە خەڵکی ناوچەکە بێکەبن.

٥- پێویستە هەرچی بەرهەم و داهاتی ناوچەکە هەیە، لە خودی ئەو ناوچەیەدا خەرج بکرێت.

٦- بەتایبەت حیزبی دیموکراتی کوردستان تێدەکۆشێت کە یەکێتی و برایەتی لە نێوان گەلی ئازەربایجان و ئەو گەلانەی لە ئازەربایجان دەژین(ئاشوری، ئەرمەنی و...) بەرقەرار بکات.

٧- حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ڕێی سوود وەرگرتن لـە سـەرچـاوە سروشتیەیە زۆر و دڵڕفێنەکانی کوردستان و گەشە پێدانی بوارەکانی کشت وکاڵـی و بازرگانی و پەرەپێدانی کاروباری ڕۆشنبیری و تەندروستی، بۆ خۆشـگوزەرانـی و ڕەفاهیەتی وەزعی ئابووری و مەعنەوی گەلی کورد خەبات دەکات[٣٧].

## ٤- پێکهاتنی کۆماری خودموختاری کوردستان

هێشتا چەند مانگێک بەسـەر پێکهێنانی حیزبی دیموکراتدا تێپەڕ نـەبـبوو کـە لەڕۆژی ٢ی ڕێبەندانی ١٣٢٤هەتاوی(٢٢کانوونی دووەمی١٩٤٦ز)پێکهێنانی ئە و حکومەتە بەم شێوەیەی خوارەوە ڕاگەیەنرا:

لە گۆڕەپانی(چوارچرا)ی مەهاباد بە ئامادەبوونی سەرانی کورد و ماشـێنێکی جیپی ئەرتەشی سۆڤیەت[٢٨]، قازی محەممەد لە سەرەوەی ئەو شوێنە تایبـەتیـەی بۆ مەراسیمەکە ئامادەکرابـوو، ڕادەوەسـتێ و پێکهێنـانی کۆمـاری خودموختـاری کوردستان ڕادەگەیەنێ. قازی محەممەد لەسـەرەتـای وتـارەکـەیـدا ئـاوا دەسـت پێدەکات:

«گەلی کورد گـەلێکی بێکـەسـن، خـاک و نیشـتمانەکـەیـان داگیرکـراوە و دابەشکراوە، وەلە سـەرەتـایی تـرین مـاف کـە مـافی دیـاریکردنی چـارەنووسـە، بێبەشـن...». لاپەڕە ١١٣ کتێبی ئەنگلتۆن.

ئینجا قازی محەممەد بە جل وبەرگی ئەفـسـەرانی ڕووسی و پلەی زەنـەڕاڵـی وەک فەرماندەی گشتی هێزەکانی کوردستان، ڕێ و ڕەسمی سەربازی لەهێزەکانی خۆی ئەبینێ و دوای بەڕێوەچوونی مـەراسـیمی ڕیـزبـەنـدی لـەشـکر -کابینـەی کۆماری مەهابادی بەم شێوەی خوارەوە ڕاگەیاند:

| | |
|---|---|
| ١- حاجی بابەشێخ | سەرۆک وەزیر |
| ٢- محەممەد حوسێنی سەیفی قازی | وەزیری شەڕ |
| ٣- محەممەد ئەمین موعینی | وەزیری کاروباری نێوخۆ |
| ٤- حاجی ڕەحمان ئاغای موهتەدی | وەزیری کاروباری دەرەوە |
| ٥- ئەحمەدی ئیلاهی | وەزیری ئابووری |
| ٦- ئیسماعیلی ئیلخانیزادە | وەزیری ڕێگاوبان |
| ٧- حاجی مستەفای داودی | وەزیری بازرگانی |
| ٨- مەحموودی وەلیزادە | وەزیری کشتوکاڵ |
| ٩- کەریمی ئەحمەدەین | وەزیری پۆست و تەلەگراف |
| ١٠- مەنافی کەریمی | وەزیری ڕۆشنبیری |
| ١١- سەدیقی حەیدەری | وەزیری ڕاگەیاندن |
| ١٢- خەلیلی خوسرەوی | وەزیری کار[٢٩] [٣٠] |

## ٥- دەرچوونی سوپای سۆڤیەت و ڕووخانی کۆماری خودموختاری کوردستان

لە گەڵ سەفەری قەوام سەڵتەنە بۆ مۆسکۆ و مۆرکردنی چەند ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان دەوڵەتی ئێران و ستالیندا، باروودۆخەکە بەزیان و زەرەری کۆماری خودموختاری مەهاباد و قازی محەممەد وەرچەرخا.

دوای ئەم سەفەرە هێزەکانی سوپای سووری سۆڤیەت، باکوری ئێران(و لەوانەش کوردستان)یان بەتەرتیب چۆڵ کرد و دوای ئەو کشانەوەیە ئێتر هێزەکانی سوپای ئێران بە فەرماندەیی سەرتیپ هومایونی لە [٣١] ١٠ی سەرماوەزی ١٣٢٥ی هەتاویدا(١٩٤٦/١٢/١٧ز) هاتنە ناو شاری مەهابادەوە[٣٢].

سەرەنجام لە پازدەی سەرماوەزی ١٣٢٥ پاش سەقامگیر بوونی سوپا لە ناوچەکەدا، قازی محەممەد و هاوەڵەکانی دەستگیر دەکرێن و دوای پێکهاتنی دادگای سوپا، قازی لە شەوی ١٠ی خاکەلیوەی ١٣٢٦هەتاوی(٣١/٣٠ مارسی ١٩٤٧ز) لە هەمان گۆرەپانی چوارچرای مەهابادا لە سێدارەدرا.

لەیادداشتەکانی (عومەر علیار) لەمەر چۆنیەتی دەستگیرکرانی قازی محەممەد و رووخانی کۆماری مەهاباد، ئاوا هاتووە:

«...سوپای ئێران بەهۆی یارمەتیە هەمەلایەنەکانی ئینگلیز و ئەمریکاوە چووە ناو ئازەربایجان و کوردستانەوە، تا لەگەڵ لەبەر یەک هەڵوەشاندنەوەی کۆمارەکانی خودموختار، دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی شا بەرقەرار و سەقامگیر بکات. (کازم ئۆف) نمایندەی شووروەوی کەوەک وابەستەو پەیوەندییەکی بازرگانی لەمەهابادا دانیشت، دەیەویست کە قازی محەممەد رازیبکات لەگەڵ خزم وکەس و نزیکانی خۆیدا ئێران بەجێ بێڵێ و بچێتە سۆڤیەت، بەڵام قازی ئامادە نەبوو مەهاباد بەجێ بێڵێ. خەڵکیش نەرۆیشتنی قازیان والێک ئەدلوەیە کە قازی وتوویەتی:

«ئەگەر من برۆم و مە هاباد بەجێ بێڵم، ئەوا میللەتی کورد ئەخەنە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوە، لێگەڕێ با من بمە قوربانی گەلی کورد.»بەڵام ئەو بۆچوون و لێکدانەوانە ناتوانرێت بەتەواوی بەڕاست وەربگیرێن. چونکە قازی فریوی گفت و بەڵێنەکانی قەوام سەڵتەنەشی خواردبوو بەوە کە بەڵێنی دابوو پشتیوانی لێبکات و مەهاباد بەجێ نەهێڵێ و مەسەلەکە تەنها مەسەلەی ئازاردان و ناڕەحەت کردنی میللەتی کورد نەبووە[٣٣].

کازم ئۆفی نوێنەری سۆڤیەتیش ناچار رۆیشتە ورمێ و قازی محەممەدیش بێهیچ جۆرە شەڕ و خوێنڕێژییەک، بۆ پێشوازی کردنی سوپای ئێران کە لە

بۆکان بوو، ڕۆیشت، و گەیشتە گوندی حەمامیان ماڵی مەحموود ئاغای نیلخانیزادە کە کەوتۆتە دە کیلۆمەتری شاری بۆکانەوە و لەوێ چاوی بە سەرتیپ هومایونی فە رماندەی هێزەکانی ئێرانی -کە بۆ ناوچەکە نیردرابوون- کەوت؛ وە کاتێک لە حەمامیانەوە بەرەو مەهاباد گەڕایەوە، هەموو ئەو چەک و تەقەمەنی و کەل و پەلی جەنگییەی هەمبوو لە مەهاباد، لە نێوان بارزانیەکان و لایەنگرانی خۆیدا بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەست هێزەکانی دەوڵەتییەوە.

ئۆردووی دەوڵەتی،واتە هێزە سەربازییەکانی حکومەتی ئێران دوای چەند ڕۆژێک ڕاوەستان لە بۆکان، ستوونێکی لەشکری بە فەرماندەیی سەرهەنگ عەلی نەکیەر غەفاری لەڕێی (بورهان)ەوە بە هاوکاری سوارانی عەلی ئاغای یار بە سەرپەرشتی ئیبراهیمی کوڕی، ڕەوانەی مەهاباد کرد. ئەوانە شەویان لە دێی کولیجە بەسەر برد و ڕۆژی دواتر سەرەتا سوپا و دوو ڕۆژیش دواتر عەشایەر هاتنە ناو شاری مەهابادەوە، لە کاتێکدا لەلایەن خەڵکی شارەکەوە هیچ جۆرە خۆشحاڵییەک یان هەست و سۆزێک بە هاتنیان دەرنەبڕا و پیشان نەدرا.

پاش ئەوەی کە گشت هێزە دەوڵەتییەکان لە مەهاباد جێگیر بوون؛ ئنجا سەرتیپ هومایونی بڕیاری ڕیزبەستن و ئامادەبوونی ئیلات و عەشیرەتەکانی دەرکرد و لە ١٠ی بەفرانباری ١٣٢٥ی هەتاوی تەواوی سوارانی عەشایەر بە سەرپەرشتی ئیبراهیم عەلی یار و مام عەزیز ئەمیر عەشایەر، لەبەرامبەر سەرتیپ هومایونی و قازی محەممەددا ڕیزیان بەست و دوای تەواو بوونی ڕێ و ڕەسمەکە، سەرتیپ هومایونی لەگەڵ قازی محەممەددا بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بۆ ماڵی قازی محەممەد بەڕێکەوتن و لەوێ پێکەوە نانی نیوەڕۆیان خوارد و بۆ سبەی هەمان ڕۆژ فەرمانی چەک داماڵین لە عەشایەر لە لایەن سەرتیپ

هومایونی‌یەوە دەرچوو، و فەرمانەکە بە هەموویان راگەیەنرا کە هەرچی زووترە چەکەکانیان تەسلیم بە دەوڵەت بکەن. عەشایەریش چەکەکانی خۆیان بە وەرگرتنی پسووڵە(رسید) تەسلیمی بەرپرسان دەکرد و خۆشیان بە بێ چەک رەوانەی ماڵی خۆیان دەکرانەوە.

ئەوەی جێی سەرسوورمانە ئەوەیە کە لە هەوەڵین رۆژەکاندا، سەرتیپ هومایونی فەرماندەی سوپای کوردستان، تاخۆقایم کردن و سەقامگیربوونی هێزەکانی لەناوچەکەدا و تا نانی نیوەڕۆی لە مەهاباد و لە ماڵی قازی محەممەددا خوارد، قسەویاسێک لە قۆڵبەستکردن و دەستگیرکردنی ئەو نەبوو.

لەو رۆژانەشدا سەدری قازی برای قازی محەممەد کە پەیوەندی‌یەکی نزیکی لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتە (ئەحمەد قەوام)دا هەبوو، لە تاران سەرقاڵی هەوڵ و تەقەللا بوو تا بەـقەولی خۆی- ئەو نالیک حاڵی بوون(سوء تفاهم)انەی لە ئارادان نەهێڵێ و جلەوگیری لە سەختگیری و توند و تیژی دەوڵەت دژبە خۆی و گەلەکەی بکات.

سەرەنجام لە ۱۵ی[۳۱] بەفرانباری ۱۳۲۵ی هەتاوی دوای جێگیربوونی سوپا لە ناوچەکە، سەدری قازیشیان لە تاران دەستگیرکرد و هێنایانەوە بۆ مەهاباد و هاوکات قازی محەممەد و محەممەد حوسێنی سەیفی قازی و ئەندامانی حکومەتەکەی و هاوکارەکانیشیان(کە۲۸کەس بوون-وەرگێر) دەستگیرکردن و رایێچی زیندانیان کردن.

دوای دەستگیرکردنی قازی محەممەد و هاورێکانی و پێکهێنانی دادگای سەربازی و دەرچوونی حوکمی لەسێدارەدان، ئەو بڕیارە بۆ جێ بەجێ کردن بە بەرپرسانی نیزامی تاران راگەیەنرا، بەڵام چونکە لێرەو لەوێ وت و وێژگەلێک بۆ لەبەر چاوگرتنی وەزعی تاوانبارکراوان(متهمان) ئەنجام دە دراو لە

لایەکی تریشەوە هێشتا شەڕ گەڵ بارزانیەکاندا دەستی پێ نەکردبوو، وەدەوڵەتیش لەو کاتەدا نەیدەویست توند و تیژیەکی بەکردەوەی ئالەو جۆرە پیشان بدات، بۆیە جێبەجێ کردنی ئەو حوکمە دواخرا، ئائەوەبوو دوای هەشتا رۆژ لەگەڵ پەنا بردنی چەکدارە بارزانیەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت و پاش سەقامگیربوونی بارودۆخی ئەمنیەتی ناوچەکە، ئیتر دادگا بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ(نجات الله ضرغامی) لە مەهاباد پێکهات و چونکە ئیدی هەندێ ئیعتیباری سیاسی و رەچاوکردنی تایبەتی لەئارادا نەمابوو، حوکمی دادگای تازە کە تۆمەتبارەکانی وەکو جاری پێشوو بە ئیعدام مەحکوم کردبوو، لە شەوی ١٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٦هەتاوی(٣١/٣٠ مارسی١٩٤٧ز) جێ بەجێ کراو لە مەیدانی(چوارچرا)دا لەهەمان ئەو جێگایەی کە کۆماری خودموختاری لێ راگەیەنرابوو، قازی محەممەد و سەدری قازی و سەیفی قازی بەدارا هەڵواسران و لە سێدارەدران[٣٥][٣٦].

## ١- ئامانجی سۆڤیەت لەسەفەرەکان و پشتیوانی کردن لە هەوڵەکانی قازی محەممەد

ئاشکرایە کە شوورەوی(سۆڤیەت) وەک رژێم یان نیزامێکی سۆشیالیستی، پشتیوانی لە حیزبە سۆشیالیست و کۆمۆنیستەکان لە ئێراندا دەکرد، وەک پشتیوانی کردن لە حیزبی توودە وەیان پشتیوانی کردن لە حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان(روودلو و جەرەیانی پیشەوەری).

بۆیە هەر لە هەمان گۆشە نیگاشەوە دەتوانین پشتیوانی و پشتگیری سۆڤیەت بۆ قازی محەممەد بۆ پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، تەفسیر بکەین. بەڵام بە چاوپۆشین لەو خاڵە و بەسەرنجدان لە رەفتار و کردەوەکانی دەوڵەتی سۆڤیەت لە ماوەی ئەو شەش ساڵەی حزووریدا لە ناوچەی مەهاباد، دەتوانین بگەینە ئەو ئاکامە کە یەکیەتی سۆڤیەت دوو ئامانجی دیاریکراوی خۆی هەبوو لە پشتیوانی کردن لە قازی محەممەد و پێکهێنانی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری مەهاباد؛ ئەو دوو ئامانجە لەبەر چاوگیراوەی سۆڤیەت بریتی بوون لە:

یەکەم/ دەوڵەتی سۆڤیەت وەک رژێمێک کە هێزە سەربازیەکانی، ناوچەکانی کوێستانی باکوری کوردستانی ئێرانیان داگیرکردبوو، پێویستی بە جۆرێک

ڕێکەوتن و هەماهەنگی هەبوو لە کوردستاندا بۆ ئەوەی لەو ڕێیەوە دڵنیایی پەیدا بکات کە هیچ زەرەرو زیانێک بە هێزەکانی ناگات.

بۆیە دەوڵەتی شۆرەوی تانکو سۆڤیەت لە سەفەری یەکەمدا قازی محەممەد و سیاسەتمەدار و سەرۆک عەشیرەتەکانی بانگهێشت کرد، بەڵام چونکە سەرۆک عەشیرەتەکان کە سەرەکیترینیان عەشیرەتی دەمۆکری بوو، پەیوەندییان لەگەڵ قەوام سەڵتەنەدا هەبوو[٣٧]، بۆیە لە دروستکردنی هەماهەنگی و یەکدەنگی لەنێوان ئەو دوو گرۆ(دەستە)یەدا سەرکەوتوو نەبوو.

بەڵام لە سەفەری دووەمدا، هەیئەتەکە یەکدەنگ و یەکگرتوو بوو، بۆیە دەوڵەتی سۆڤیەت پشتگیری و پشتیوانی ڕەسمی خۆی بۆ قازی محەممەد و هەڤاڵکانی ڕاگەیاند.

وە لەو لێکۆڵینەوەیەدا وەک سەرنجمانداوە، بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە هێزەکانی سۆڤیەت باکوری کوردستانیان داگیرکردبوو، لە لایەن کوردەکانەوە بەتایبەت لە لایەن لایەنگرانی قازی محەممەدەوە هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشت.

دووەم/ ناسانجیترین دەوڵەتی سۆڤیەت لەم پشتیوانیلێکردنەدا، بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە یەکێتی سۆڤیەت پێویستی و نیازمەندی بە چەند پێگە و پارسەنگێکی سیاسی هەبوو دژ بە دەوڵەتی ئێران. بە شێوەیەکی گشتی ئێمە لە خەرمانانی ١٣٢٠هەتاوی(١٩٤١ز) بەدواوە شاهیدی ئەوەین کە دەوڵەتی سۆڤیەت لە بواری بەدەست هێنانی پێگەی سیاسی لە ئێراندا لە بەرامبەر ئینگلیزدا لە پاشەکشەدا بوو، واتە ئینگلیز لەو بوارەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو کە توانی بەهۆی گۆڕینی ڕەزاشا و لە جێگەدانانی محەممەد ڕەزاشا، دەوڵەتی ناوەندی ئێران بخاتە خزمەتی خۆیەوە.

بۆیە دەسەڵات پەیدا کردنی هەریەک لە حیزبی تودەی ئیرانی و حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان و حیزبی دیموکراتی کوردستان، دەیتوانی چەند پارسەنگ یاخود چەند پێگەیەک بۆ سۆڤیەت دابین بکات تا لەو رێگەیەوە لە دەوڵەتی ناوەندی ئیران ئیمتیاز وەربگرێت[٣٨].

بۆیە دەبینین کە دوای وت و وێژ و رێکەوتنی قەوام سەڵتەنە سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی ئیران لەگەڵ هەیئەتی دەسەڵاتدارێتی سۆڤیەتدا[٣٩]، سۆڤیەتیەکان لە باکوری ئیران دەچنە دەرەوە و حیزبی دیموکراتی کوردستان و قازی محەممەد بەتەنها بەجێ دێڵن[٤٠].

بەپێی نووسینی(ویلیام ئەگلتۆن) لە کتێبی کۆماری ١٩٤٦دا، دوای دەرچوونی سۆڤیەت لە کوردستان لە(ئانلەرە گرۆمیگۆ)کە ئەو کاتە نوێنەری هەمیشەیی سۆڤیەت بوو لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پرسیار کرا:

«... ئیستا کە سوپای سوور لە ئازەربایجان و کوردستان دەردەچێت، ئایا بارودۆخ و چارەنووسی کوردەکان چی دەبێت؟ ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دەدایەوە:

ئەم کارە کێشەیەکی ناوخۆیی ئیرانە و ئیمە مافی دەستێوەردانمان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتانی تردا نییە...»!

## ٢- تەفسیر و لێکدانەوەی نادیار و یەک لایەنە لە بارەی قازی محەممەد و چۆنیەتی پێکهاتنی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری مەهاباد

لەژێر رۆشنایی ئەوەی کە لە هەردوو بەشی دووەم و سێیەمدا خستمانە روو، لە لێکدانەوە و راڤەکردنی هەل و مەرجی سیاسی و- کۆمەڵایەتی سەردەمی قازی محەممەددا، سێ تەوەرە(محور) پشتگوێ خراون:

١- ناتاجی و نیازمەندی خەڵکی مەهاباد بە ئەمن و ئاسایش لە بەرامبەر هێزەکانی رووسی و ئەگەری هێرش و پەلاماری عەشایەر و ئەو دەورو رۆڵەی کە قازی محەممەد لەو بوارەدا گێڕای.

٢- دروست بوون و شکڵ گرتنی کۆمەڵەی(ژ.ک.ف)، مەسەلەیەکی پێشووترو(سابقە) دار بووە و دەبێ خاڵی دەستپێکردنی سەرەتا بۆ کوردستانی سەربەخۆلەسەرەوی دەوڵەتی عوسمانی لە شەری یەکەمی جیهانی و دواتریش بۆ شاری سلێمانی(کوردستانی ئێستای عێراق) لە نێوان دوو شەری جیهانیدا، بگیردرێتەوە و حسابی بۆ بکرێت، نەک لە هەوڵەکانی قازی محەممەدەوە.

٣- مەسەلەی ئامادەگی و نفوزی سیاسی کەسانی دەوڵەتی سۆڤیەت لە پێکهاتنی حیزبی دیموکرات و کۆماری خودموختاری مەهاباددا.

بێ ئاگابوون لەو خاڵانەی سەرەوە و خۆ لەقەرە نەدانیان، بەر لە هەموان لە راڤە و لێکدانەوەکانی سەرانی حیزبی دیموکرات و توێژینەوەکانیاندا رەنگ ئەداتەوە؛ چونکە هیچ چەشنە روونکردنەوەیەک لەمەڕ ئەو راستیانەوە راناگەیەنن؛ بەڵکو میللەتی کورد بۆ رێگایەک بانگ دەکەن کە قازی محەممەد سەری خۆی لەپێناویدا نایەوە.

١- بگەڕێوە بۆ بەرنامەکانی دەنگی کوردستان (رادیۆی حیزبی دیموکرات) بەتایبەت توێژینەوە و لێکدانەوەکانی ئەو رادیۆیە بە بۆنەی ساڵرۆژی دامەزراندنی کۆماری خودموختاری مەهاباد لە دووی ڕێبەندانی هەر ساڵێکدا.

٢- لانی کەم تا ساڵی (٦٥ی هەتاوی- ٨٦ز) ئەو حیزبە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی وا کە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پێوەندی بە مەسەلەی قازی محەممەدەوە هەبێت دەرنەخستووە.

**تێبینی وەرگێڕ :** عەبدولڕەحمان قاسملو ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوی (١٩٨٦ز) چاپی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبی (چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی) بڵاوکردەوە، کە بریتییە لە کورتەیەک لە مێژووی (ح.د.ک.ئ)، دیارە لە نووسراو و ئەدەبیاتی دواتری حیزبی ناوبراودا لێکۆڵینەوە و بابەتی زۆر بڵاوکراونەتەوە لە بارەی قازی محەممەدەوە، بۆ نموونە جگە لەو کتێبەی سەرەوە ڕۆژنامەی (کوردستان) ئۆرگانی حیزبی ناوبراوم لە بەر دەستە کە وتارێکی دوور و درێژی لە سەر قازی محەممەد تێدایە بە پێنووسی جەلیل گادانی . کوردستان ژ/٣٠٧/ ٢١ی خاکەلێوەی ١٣٨٠هەتاوی/١٠ی ئەپریلی ٢٠٠١.

٣- ئەم ئامانج و بانگەشەیەی سەرەوە، لە مەرامنامە و بلاوکراوە و پەیڕەو و پرۆگرامی حیزبی دیموکرات وەرگیراوە، کە لە بەشی سەرچاوەکان لە کۆتایی ئەم نووسینەدا ئاماژەیان پێدراوە.

٤- لە بەر ئەوەی کە ناوەرۆکی ئەم نووسینە بریتی‌یە لە سەرنج و لێکۆڵینەوە لەمەر پێشەکی دووەمی ئەم بەڵگەکاری‌یە، بۆیە رەنگە ئەو پرسیارە بۆ خوێنەر بێتە پێشەوە کە مەگەر (پێشەکی) بەکەم رەخنە هەڵناگرێت و جێی سەرنج نی‌یە، ئایا میللەتی کورد میللەتێکی جیاواز لە میللەتی ئیران و سەربەخۆیە؟! خوێنەری بەڕێز دەتوانن سەیری کتێبی (کرد و پیوستگی تاریخی و نژادی او) نووسینی دکتور رشید یاسمی بکات کە بە دوور و درێژی وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە.

**تێبینی وەرگێڕ :** وادیارە رای نووسەری ئەم کتێبە وایە کە کورد گەلێکی سەربەخۆ و جودا لە میللەتی ئیران نەبێت، کە بە ڕاستی ئەمە بۆ خۆی جێگای سەرنجە...چونکە کورد میللەتێکی سەربەخۆ و خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیەتی و خاوەنی هەموو ئوخم و کۆڵەگەیەکی پێکهاتنی نەتەوەیی‌یە لە خاک و زمان و نەژاد و ...هتد. میللەتی ئیرانیش تەنها لە گەلێک و رەگەزێک پێکنەهاتووە، بەڵکو لە ئیراندا چەندین گەل و رەگەزی جیاواز دەژین کە هەموویشیان خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیانن لە چوارچێوەی ئێراندا، وەکو گەلی(کورد و ئازەری)...

خۆ ئەگەر مەبەست گەڕانەوە بێت بۆسەر سەرچاوەی نەتەوەی کورد کە میدی‌یەکانن، چونکە زۆر مێژوونووس وایان خەملاندووە و دانیان بەوەدا ناوە کە سەرچاوەی ئەم گەلە بۆ ئەوان واتە بۆ(میدی‌یەکان) دەگەڕێتەوە؛ ئەوا لەو حاڵەتەشدا ئەوە ناگەیەنێ کە کورد بەشێک لە ئێرانیەکان یاخود(فارسەکان)بن،

چونکە لە لایەکەوە زۆرێک لە توێژەرەوە و مێژوونووسان چەندین بۆچوون و تیۆری جیاجیایان خستۆتە ڕوو نەک لە بارەی تەنها کوردەوە؛ بەڵکو لە بارەی گەل و ڕەگەزە جۆراوجۆرەکانی خۆرهەڵاتی نێوەراستە کە بۆ چ ڕەگەز و نەژادێک نەبەت نەدرێن. چونکە سروشتییە لە ئەنجامی شەڕ و شۆڕ و لەشکرکێشی و جیاوازییە بەردەوام و یەکتر کوژکردنەوەکان و ... هتد یەوە زۆر گەل و ڕەگەز و زمان و خەوسیاتی نەتەوەییەیان، کەوتنەبەر هەرەشەی جەدی لەناو چوون و توانەوە و پاشان ئەستەم بوونی دیاری کردنی سەرچاوە و زێد و نیشتمانی ئەسڵی و تایبەتی خۆیان کە لەو بارەوە کۆمەڵناسان و مێژوونووسان قسەی زۆریان هەیە.

لە لایەکی تریشەوە میدییەکان چەند سەدەیەک پێش فارسەکان هاتوونەتە ئێرانەوە و دەوڵەت و شارستانێتی تایبەتی خۆیان دروست کردووە.

لەو بارەوە د.کمال مەزهەر لە کتێبی(چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد)دا دەڵێ:

«... بەڵێ ئەوا ونمان میدیەکان کە سەرچاوەی گەلی کوردن بە فارسی دەدوان، کەواتە فارسەکان و میدیەکان هەردووکیان یەک گەل بوون، چونکە زمانیان یەک بووە.

ئەگەر وابێت ئەوساکە ئەم دوو پرسیارە ڕێگەمان لێ ئەگرێت و بە درۆمان دەخاتەوە:

یەکەم : ئەگەر ئەم دوو گەلە یەک بوون و جیاوازییان نەبوویێت لە زمانا، ئەی چۆن میدییەکان ماوەیەکی دوور و درێژ فارسەکانیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە؟

دووەم : بۆچی فارسەکان هەوڵی جیابوونەوەیان دەدا لە دەوڵەتی میدییەکان بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی نوێی سەربەخۆ دابمەزرێنن؟

هیچ وەڵامێک نی یە لەوە زیاتر کە بێ گومان زمانیان جیاواز بووە لە زمانی میدی و گەلانیش بەزمان و شێوەلێک جیادەکرێتەوە ...».(بەشی یەکەم/ لاپەڕە١٩٠..چاپی ١٩٨٥/بەغدا.)

لە کۆتاییدا بەوتەیەکی مێژوو نووسی فارس(حەسەن ئەرفەع) دوماهی بەم تێبینییەم دێنم کە ناوبراو دوای باسکردنی زمان و نەژادی کوردان و ئەوەکە زۆرێک لە مێژوونووسانی عەرەب و خۆرهەڵاتناسی ئەورووپی لە سەدەکانی نۆزدە و بیستدا هەولیان داوە کە بە هۆی لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵناسی و نەژادناسییەوە، بنچینەی کوردان دیاری بکەن .. دەڵێت:

« .. هەروەها زۆر تیۆر و بۆچوونی تر لە لایەن دەوڵەتانی بەدەسەلاتی خۆرهەڵاتی نیوەڕاست هێنراونەتە گۆڕ بۆ ئەوەی کوردەکان بۆ چەند میللەتێکی تر وەکو تورک و غەیرە، بگێڕنەوە. بەڵام ئەم تیۆرانە لە ئەسڵدا بە مەبەستی تەماحی سیاسی بووە و لە ڕووی نەژاد ناسییەوە هیچ ئەرزش و بایەخێکی نی یە ..»بڕوانە(کردها و یک بررسی تاریخی و سیاسی)حسن ارفع ل٨-٩.

٥- جەنگی جیهانی دووەم لە ٢ی ئە یلولی ١٩٣٩از دەستی پێکرد و لە ٩ی ئایاری ١٩٤٥از کۆتایی پێ هات. (وەرگێر)

٦- قاسملو-د.عبدالرحمن لە بارەی جوگرافیا و ڕووبەرو ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی ئێرانەوە دەڵێت:

«کوردستانی ئێران بە چوار ئوستانی رۆژئاوای ئێران دەگوترێ کە بریتین لە : ئازەربایجانی رۆژئاوا، کوردستان، کرماشان و ئیلام. دەوڵەتی ئێران بەرەسمی هەر ئوستانی کوردستان کە ناوەندەکەی سنەیە بە کوردستان ناودەبا.
پێوانەی کوردستان ١٢٥/٠٠٠کیلۆمیتری چوار گۆشەیە، کە دەکاتە سەدی هەشتی(٨٪) خاکی ئێران. ژمارەی دانیشتووانی کوردستان ٧ملیۆنە، کە هەڵدە لەسەدی هەموو دانیشتووانی ئێرانە. لەو ٧ میلیۆنە ٣میلیۆن لە شارەکان دەژین. (ژمارەکان پەیوەندیان بە کاتی نووسینی کتێبەکەوە هەیە و ئێستا زۆر زیادیان کردوە، وەرگێر) لە زەمانی یەکەمانی کۆماری کوردستاندا ، ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی ئێران ٣ملیۆن کەس بوو، کە لەوانە ٣٠٠/٠٠٠ نەفەریان لە شارەکان ژیاون . لە ماوەی چل ساڵدا ژمارەی دانیشتووانی شارەکان دە هێندە زیادی کردووە و هێندێک شاری زۆر گەورە لە کوردستان پەیدا بوون. ئەمرۆ شاری کرماشان لە یەک میلیۆن زیاتر دانیشتووی هەیە ...». بڕوانە چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، عبدالرحمن قاسملو، بەرگی یەکەم/ چاپی دووەم ١٩٨٨/ ل ١٤. (وەرگێر)
٧- رەنگە نووسەر زانیاری تەواوی لەسەر کوردستان و شارەکانی نەبێت، ئەگینا جگە لەو شارانەی بەڕێزیان باسی کردوون شاری دێرین لە کوردستان زۆرن وەک شاری کەرکوک و شاری هەولێری دێرین کە مێژووی دروست بوونی ئەک سەدان بەڵکو بۆ هەزاران ساڵ و پێش زایینیش دەگەڕێتەوە ..! (وەرگێر)
٨- زانیاریەکانی سەرەوە لەمەڕ شاری مەهاباد تا ئەو جێگایەی بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویست بووە، وەرگێراوە، و خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بۆ زانیاری و

شارەزایی زیاتر لە بارەی بارودۆخی جوگرافی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ئەو شارە، بگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

لاپەڕە ٥٣ تا ٥٤ی کتێبی ئەنگلتۆن، و بەتایبەت کتێبی (مێژووی مەهاباد) نووسینی محەممەدی سەمەدی، (ئینتیشاراتی سەیدیانی مەهاباد).

٩- قازی محەممەد مەلایەکی کورد بوو کە توانی لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٩٤٦ز)دا کۆمارێکی خودموختاری تەمەن یەک ساڵە لە شاری مەهاباددا پێکەوە بنێت کە لە گەڵ دەرچوونی سوپای سووری سۆڤیەت (شوورەوی) لە باکوری ئێران، ئەو کۆمارەش رووخاو قازی دەستگیر کرلو پاشان لە سێدارە درا.

لە بارەی قازی محەممەدەوە، ئەنگلتۆن نووسەری کتێبی(کۆماری مەهاباد) بەم شێوەیە دەنووسێ:

«قازی محەممەد، کوڕی قازی عەلی، یەکێ لە بەڕێزترین و بە نفوزترین قازیەکانی رۆژگاری خۆی و ئەوەی قازی قاسم بوو... هەروەک لەو رۆژگارەدا باو بووە، قازی دەخرێتە بەر خوێندن و لە قوتابخانە دائەنرێ تا لای باوکی دەرس بخوێنێ... بەرلەوەی لە لایەن باوکیەوە وەک قازی دیاری بکرێت، سەرۆکی فەرمانگەی ئەوقافی مەهاباد دەبێ». (لاپەڕەی٦١-٦٢) ئینتیشاراتی سەیدیانی مەهاباد.

١٠- قازی محەممەد رۆژی ١١ی بانەمەڕی ١٢٧٩ی هەتاوی (١ی ئایاری ١٩٠٠ز) لە شاری مەهاباد لەدایک بووە، کاتێ لە سێدارە دراوە تەمەنی لە (٤٧) ساڵی دابوو. رابردووی ئەو بنەماڵەیە وەک جەلیل گادانی دەڵێ لە شاری مەهاباد بۆ چوار سەدە پێشتر دەگەڕێتەوە، نەتەنیا لە لای خەڵک بەڵکو لە لای دەسەڵاتدارانیش و بەرپرسانی حکومەتیش جێی رێز و تەقدیر بوون.. لە شەڕی

یەکەمی جیهانی‌دا پیاوی وەک میرزا فەتتاحی قازی‌یان لە بەرەنگاری راستەوخۆ لە گەڵ رووسان لێ شەهید بوو، کوڕە لاوەکانیشی(سالار و محەممەد) بە دیل گیران و بۆ شوێنە دوورەکانی رووسیەی ئەو کات بەرێ کران و تا شۆرشی ئۆکتۆبەر هەر لە ئەسارەت‌دا بوون. قازی عەلی باوکی پێشەوا، لە ۱۹۳۰ز لە مەهاباد، رێکخراوێکی کوردی بە ناوی«بووژانەوەی محەممەدە» پێکهێنا. ناوبراو لە گەڵ جوولانەوەی شێخ محمد خیابانی لە تەوریز پێوەندیان هەبوو، تا ساڵی ۱۹۳٤یش کە فەوتی کردووە لە سەر ئەو کارە بەردەوام بووە.

قازی محەممەد زۆری حەز بە تێکەڵاوی دەگەڵ ئەهلی فەزڵ و زانایانی کاتی خۆی و پیاوچاکان و سەرۆک عەشیرەتەکان و کوردە نیشتمان پەروەرەکاندا هەبووە.

قازی هەروەها رۆشنبیرێکی بەتوانا بووە لە کاتی خۆیدا لە زانستە نوێکان و رووداوەکانی جیهان و باروودۆخی دنیا شارەزا بووە و زمانەکانی کوردی و تورکی و فارسی و ئینگلیزی و عەرەبی و فەرەنسی و رووسی(هەندێ دەڵێن ئازەریشی) زانیوە، لە زانستەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتی‌دا دەستێکی باڵای هەبووە، جل و بەرگی مەلایەتی دەپۆشی(کە عەبا و مێزەر بوون)، بەڵام دواتر تەنها مێزەرەکەی هێشتەوە و عەباکەی لادا بوو. قازی زۆر لای خەڵک خۆشەویست بوو چونکە لێیان نزیک بوو و مشووری دەخواردن و بەدەم گیر و گرفتیانەوە دەچوو بەتایبەت خەڵکی مەهاباد، بۆیەش بۆ یەکەم جار لە مێژووی خۆیدا خـــەڵـــک خـــۆی ئازنـــاوی «پێشـــەوا»یـــان پێـــدا بـــوو..

بۆ زیاتر شارەزا بوون لە بارەی کەسایەتی قازی محەممەد بڕوانە:

-چل ساڵ خەبات لە رێی ئازادی/قاسملو بەرگی یەکەم/ ل ۱۱۸-۱۲۸

-کردها و یک بررسی تاریخی و سیاسی/حسن ارفع

-ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە ٣٠٧ی ڕۆژی ١٠ی ئاوریلی ٢٠٠١، وتاریک لەبارەی شەخسیەتی قازی محەممەدەوە بە قەڵەمی جەلیل گادانی. (وەرگێر)

١١- بڕوانە دەستنووسی سەیید قادر جەعفەری خەڵکی مەهاباد و لێکۆڵەرەوە لە بواری سەرچاوە کوردییەکاندا. ئەم دەستنووسە لە کتێبخانەی پارێزگای کوردستان(واتە سنە- وەرگێر) دەست دەکەوێت.

١٢-لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ڕووسەکان لە شاری مەهاباد و دەوروبەریدا دوای قەتڵوعامی زیاتر لە سەدان کەس لە خەڵکی بێتاوان و ئاگر تێبەردانی تەواوی بازاڕی شارەکە، ئەوێیان بەجێ‌هێشت. یادەوەری ئەم کۆکوشتارە هەروا لە بیری خەڵکیدا مابۆوە. بۆیە خەڵکی ئەو ناوچەیە زۆر ترسیان لە ڕووسەکان هەبوو، (بە پێی نووسینەکانی نیکیتین، لە کتێبی ئەو ئێرانەی کە من ناسیم). فەرماندەی ئەم قەتڵ و عام و کۆکوژییە، ژەنەراڵێک بووە بەناوی ڕیبال چێنکۆ. چاپخانەی مەعریفەت، نووسینی نیکیتین، وەرگێرانی فرەوشی(هومایونی پێشوو) لاپەڕە ٢٠٧ و ٢٠٦ و ٢٠٥ ، لەگەڵ پێشەکی «ملک الشعرای بهار» مێژووی ١٣٢٩ی هەتاوی. هەروەها بۆڵتن(نووسراو)ی مەهاباد دوێنێ و ئەمڕۆ، چاپەمەنی شارەوانی مورخ ١٣٥١ی هەتاوی.

١٣- بێ هۆ نییە کە حیزبی دیموکراتی کوردستان دوای نیوەڕوونی چل ساڵ، یەکێک لە هێزەکانی خۆی بەناوی پێشەواوە ناو ناوە.

١٤- بڕوانە نووسراوی: چاوخشاندنێکی تر بە ژێ،کافدا، بیرەوەری یەکێ لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژێ،کاف مەلا قادری مودەڕڕیسی، پاییزی ١٣٦٣هەتاوی(١٩٨٥ز). ئەم نووسراوە لە کتێبخانەی پارێزگای کوردستاندا دەست دەکەوێت.

١٥- خوێنەری بەڕێز پێویستە ئەوە بزانێ کە تا پێش شەڕی چاڵدێران کە لە نێوان سەربازانی شائیسماعیلی سەفەوی و سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا لە ناوچەی چاڵدێران کە کەوتۆتە ناوچەی ماکۆی ئێران، ڕوویدا، هەموو ناوچە کوردنشینەکان بەشێک بوون لە خاکی ئێران و پاش تێشکانی ئێران لەو جەنگەدا دوو‌سێ‌یەکی ٢/٣ ناوچە کوردییەکانی ئێران کەوتنە ژێر دەسەڵات و قەڵەمڕەوی عوسمانی(واتە کوردستانی ئێستای عیراق و تورکیای ئێستا).

وە لە دوای شەڕی ناوبراوەوە ئێمە شاهیدی چەندین دەرگیری و تێکهەڵچوونین لە شانۆی سیاسی کوردستان. چونکە لە لایەکەوە دەوڵەتانی ئێرانی هەوڵیان ئەدا کە عەشیرەتە کوردەکان بەناوی ئێرانی بوونەوە بەلای خۆیانـدا ڕابکێشن و دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەکاریان بێنن، و لە لایەکی دیکەشەوە دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی ئەدا عەشیرەتەکانی کورد بەو ناوەوە کە سوننین دژی دەوڵەتی ئێران بەکار بێنێ.(بڕوانە کتێبی عالم آرای عباسی، انتشاراتی امیر کبیر).

**تێبینی وەرگێڕ:** نووسەر ئاماژەی بە شەڕی چاڵدێران کرد.. ئەم شەڕە لە ساڵی ١٥١٤ز بەرامبەر ٩٢٠ی کۆچی مانگیدا ڕوویداوە و دواتر بە پێی پەیمانێک کە لە نێوان شاعەبباس و سوڵتان مورادی عوسمانیدا بەسترا ساڵی(١٦٣٩ز) دابەشبوونە کە ڕەسمییەتی پێدرا، تا ئێستاش سنووری کوردستانی ڕۆژهەڵات گۆڕانێکی وای بەسەردا نەهاتووە و وەکو خۆی ماوەتەوە..

بەڵام بەڵاو نەگبەتی گەورە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و بە پێی پەیمانی شوومی سایکس‌پیکۆ ڕوویدا کە کوردەکانی عوسمانی لە نێوان سێ دەوڵەتـدا دابەشکران کە(عیراق، تورکیا، سوریا) بوون و هەندێکیش بۆ یەکێتی سۆڤیەت کران بە دیاری، ئەمە جگە لە بەشە خێرەکەی ئێران و هەرچی خەون و خولیا و

ناواتی کوردان بوو زیندەبەچاڵ کران و تا ئیستاش ئەم گەلە هەربە دابەشکراوی و پەژموودەیی و دوور لە ئازادی و مافی نیشتمانی لەم چەرخی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و جیهانگەرایی‌یەدا !! ژیان دەباتە سەر.

١٦- دوو پیتی ژێ.کاف کورتکراوەی دوو وشەی کوردین واتە(ژیانەوەی-کوردستان)، وە کۆمەڵە بانی(جمعیت)، کەوا بوو مانای کۆمەڵەی ژێ.کاف بە کوردی دەبێتە: کۆمەڵەی نوێکردنەوەی ژیانی کوردستان/سەیری کتێبی ئەنگلتێن(هەمان سەرچاوە) لاپەرە ٦٧، بکە.

١٧- سەبارەت بە ڕێ و شوێن و نادابی ئەندامبوون لەو کۆمەڵەیەدا ئەنگلتێن لە لاپەرە ٦٧ی کتێبەکەیدا ئاوا دەڵێت:

هاتە نێو ریزی ئەو کۆمەڵەیە بەم شێوەیە بوو کە سەرەتا ئەو کەسەی دەبووە ئەندام دەبوایە بڕواتە گەرماو(حمام) و لە ڕووی شەرعی‌یەوە خۆی پاک و خاوێن بکردایەوە ئنجا زۆر بە نهێنی بڕواتە لای سێ کەس لە ئەندامە کۆنەکان و حەوت جار سوێند بە قورئان بخوات بۆ لە بەر چاو گرتنی ئەو شەش مەرجەی بۆ ئەندامیەتی دانرابوو.

**تێبینی وەرگێر:** ئەو ئەندامە تازەیە غەیری ئەو سێ کەسە نەدەبوو هیچ کەسێکی دیکە بناسێ، بڕوانە(ژێ.کاف) چبوو، وە چی دەویست و چی لێ بەسەرهات؟ سەید محەممەدی سەمەدی/ ١٩٨١ز،ل.١٤. (وەرگێر)

١٨- وانازانم کۆمەڵەی ژێ.کاف لە کوردستانی عێراق دروست بوو بێ، بەڵکو لە مەهاباد و لە ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١ی هەتاوی بەرامبەر١٦ی ئابی ١٩٤٢ز پێکهات، ئەومندە هەیە کە پەیوەندی توند و تۆڵ لە نێوان ژێ.کاف و حیزبی هیوادا هەبووە کە ڕێکخراوێکی کوردی عێراق بوو لە لایەن چەند

ڕۆشنبیرێکی کوردی عیراقی بە سەرۆکایەتی ڕەفیق حیلمی و مەحموود جەودەتەوە دامەزرابوو لە ساڵی ١٩٣٩از کە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی ژێ،کافەوە نوێنەری خۆیان ڕەوانەی مەهاباد کردبوو کە (میرحاجنەحمەد) بوو و بەشداری یەکەم کۆبوونەوەی ژێ،کاف دەکات، ناوبراو ئەفسەرێکی سوپای عیراق بوو.. هەر ئەم پەیوەندیەیش نووسەر خۆی دوایی ئاماژەی پێدەکات..

١٩- بڕوانە پەراوێزی(١٧)..

٢٠- بەڵام بە پێی لیدوانی (مەلا قادر مودەرریسی) یەکێک لە دامەزرێنەرانی ژێ،کاف، ژمارەی دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیە یازدە کەس بوونە کە بریتین لەمانە:

محەممەدی نانەوازادە، عبدالرحمن زەبیحی، حوسێنی فروهەر، عبدالرحمن ئیمامی، قاسمی قادری، مەلا عەبدوڵڵای داودی ناسراو بە مەلای حەجۆکی، محەممەد یاهوو، مەلا قادر مودەررسی، سەدیقی حەیدەری، عبدالرحمانی کەیانی، وە میرحاجی عیراقی کە لە پێکهاتنی تۆخمی ژێ،کافدا لەوێ بووە..بڕوانە(محەممەدی سەمەدی/ژێ،کاف چیبوو..؟سەرچاوەی پێشوو ل١٥).

(وەرگێر)

٢١- لەم بارەیەوە جەلیل گادانی دەڵێت:

«... قازی لەبەر حورمەتی تایبەتی کە بۆ ژ-کێ هەبوو، بناغەی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتیشی هەر بە ٢٥ی گەلاوێژ بنچینەی دامەزراندنی ژ-ک داناو هەر بۆیەش سەرنجی زۆربەی نیزیک بەتەواوی بەرپرسانی بۆ تیکۆشان لە نێو حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕاکێشا...». ڕۆژنامەی کوردستان/ژ٣٠٧،

(وەرگێر)

٢٢- ئەڵبەتە لە میانەی ئەم لێکۆڵینەوەیەماندا بۆمان دەرکەوت کە ئاغای عەبدولرەحمان رەسولی برای بچوکی دڵشاد رەسولی یەکەمین سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە لە عێراق کۆچی دوایی کردووە، لەو باوەڕە دایە کە قازی محەممەد لە ماڵی ئەواندا سوێندی خواردووە(ئەم کەسە نیستا لە ژیاندایە) و ئەو قورئانەشی کە سوێندی پێ خواردووە هێشتا لە ماڵەکەی ئەواندا ماوە.

٢٣- قازی محەممەد، عەلی ئاغای عەلی یار، سەرۆکی عەشیرەتی مەجیدخان، ئەمیر موکری، عەلی خان ئەوزەری مەنگور، بایەزید ئاغا عەزیزی گەورک، محەممەد حوسێنی سەیفی قازی، رەشید بەگی هەرکی، زێرۆ بەگی هەرکی، سەرتیپ شکاک، حەسەن تیلکۆ شکاک، کاک هەمزە قادری مامەش، ئەحمەد خانی فاروقی فەیزوڵڵا بەگی، حەسەن عومەری شکاک، محەممەد ئاغا وسوق قاسملو، محەممەد ئەمین بەگ فەیزوڵابەگی، نوری سەیید تەها و قوبطاس مامەدی شکاک.

٢٤- مەناف کەریمی، عەلی ریحانی، قاسمی موهتەدی، محەممەد حوسێنی سەیفی قازی، عەبدوڵڵای قادری مامەش، هەمزە ناڵوسی مامەش، نوری بەگی هەرکی.

٢٥- باقرۆف ئەوکاتە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان بوو، بەڵام ناوبراو تەنها وەک سکرتێری ئەو حیزبە یاخود وەک سەرکۆماری ئازەربایجانی شۆرەوی قسەی نەدەکرد، بەڵکو بەناوی یەکێتی سۆڤیەتیەوە قسەی لەگەڵ شاندی کورددا دەکرد و پێی راگەیاندن کە بەگشتی ئامادەن پشتیوانی لە بزاڤی کورد و پێکهێنانی حکومەتێکی میللی لە کوردستانی ئێران بکەن، ناوبراو پیاوێکی خاوەن

دەسەڵات و نفووزێکی زۆر بوو لە دەزگای سۆڤیەتی‌دا و بەدەسەڵات و لـەخـۆرا دیتنێکی تەواوەوە دەدوا و جـۆری بـاوەڕ و متمانـەی (سـتالین) و هـەمـەکـارە و دەسـترۆیشتووی ئازەربایجانی سۆڤیەت بوو..

جۆری سەرنجە کە دوای مردنی ستالین لە ساڵی ١٣٣٤ی هەتاوی‌دا بـاقرۆف لەگەڵ بێریا کە وەزیری ناوخۆی سۆڤیەت بوو، هەردووکیان دادگایی دەکـرێن و لە سێدارە دران. لە دادگادا دەرکەوت کە باقرۆف لە کوشـتنی (٢٠)هـەزار کـەس بەرپرسیار بووە و یەکێک بووە لە تاوانبارانی جەنگ !! بڕوانە(چل ساڵ خـەبـات/ قاسملو ب١ـەرچاوەی پێشوو ل ٦٤، ١٥٢، ١٥٣). (وەرگێر)

٢٦- بەڵگەنامەکانی پەیوەندیدار بەم دوو سەفەرەوە لـە یادداشـتنامە دەسـت نووسـەکانی ئاغای عومەری عەلی‌یار کوری عەلی ئاغای عـەلـی‌یـار، وەرگیـراون، بەڕێزیان ئیستا هەر لە ژیاندایە و لە شاری مەهاباد دەژیت، نـاوبراو لـە هـەر دوو سەفەری قازی محەممەددا ئامادەیی هەبووە و رۆڵی سـەرەکـی لـەو دانیشـتنانەدا بینیوە.بڕوانە/ دەسـتنووسی ناوبراو لە کتێبخانەی پارێزگای کوردستاندا.

٢٧- ئەنگلتون لە لاپەرە(٢٨٠)ی کتێبەکەیدا، لـەبـەرامبـەر وێنـەیـەکـدا کـە هێناویەتی، دەری دەخات کـە ڕۆژی ٢٦ی سـەرمـاوەزی ١٣٢٦ هـەتـاوی(١٧ی دیسـەمبەری ١٩٤٥ز) وەختێک کە بوون و هاتنە مەیدانی حیزبـی دیمـوکرات بـە ئاگاداری خەڵک دەگـەیـەنرێت، ئـاڵای ئێـران جـێی خـۆی دەدات بـە ئـاڵای کوردستان.

**تێبینی وەرگێر:** ئاڵای کوردستان بریتی بوو لە سێ ڕەنگی سوور و سپی و سەوز بە پێچەوانەی ئاڵای ئێران، و لە خوار ڕەنگی سپی‌دا خۆرێک لـەگـەڵ دوو

گوڵە گەنم ڕەنگی کیشرابوو؛ دواتر ئاڵاکە ڕەسمیەتی وەرگرت و لە شارەکانی مەهاباد و شنۆ و نەغەدە و شوێناتی تر لەسەر فەرمانگەکاندا بەرز کرایەوە.

٢٨- لەو گۆڕەپانەدا (پەرماکۆف) لە کاتێدا لە ناو ئۆتۆمبێلە جیپی بەکەیدا دانیشتبوو، لە دوورەوەمرا تەماشای بەڕێوەچوونی جەرەیانی ئاهەنگ و ڕێ و ڕەسمەکەی دەکرد. لاپەرە/١١٣ی کتێبی ئەنگلتون.

٢٩- لە لاپەرە ٢٨١ی کتێبی ئەنگلتوندا، لە میانەی وێنەیەکدا، ڕاگەیاندنی کۆماری مەهاباد لە لایەن قازی محەممەدەوە لە مەیدانیچوارچرادا لە ڕۆژی ٢ی ڕێبەندانی ١٣٢٤دا هەتاوی عەکسبرداری کراوە و پیشاندراوە.

٣٠- لە زۆربەی سەرچاوەکاندا کە من ئاگادارم کابینەی حکومەتی کوردستان بە(١٣) کەس هاتووە کە (محەممەدی ئەیوبیان)یش بە وەزیری تەندروستی دیاری کراوە. لە هەندێ جێگاشدا ناوی وەزیرێکی تر بە ناوی (مەلا حوسەینی مەجدی) وەک وەزیری داد هاتووە.. (وەرگێر).

٣١- هاتنی سوپای دەوڵەتی ناوەندی بۆ ناو شاری مەهاباد لە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەز (١٧ی کانوونی یەکەم)دا بووە نەک لە ١٠ی سەرماوەزدا وەک دانەر نووسیویەتی، هەروەها دەستگیرکرانی قازی و هاوەڵەکانیشی لە مانگی بەفرانباردا بوو نەک سەرماوەز. (وەرگێر)

٣٢- درێژەی باسی چۆنیەتی هاتنی سوپای ئێران بۆ مەهاباد لە کتێبی (از مهاباد خونین تا کرانەهای ارس، نووسینی نەجەفقولی پەسیان، ئینتیشاراتی بنگاه مطبوعاتی امروز، ساڵی ١٣٢٨ی هەتاوی‌دا) هاتووە.

٣٣- قاسملو لەو بارەوە دەڵێ: «.. پێشەوا قازی بە تاقیکردنەوە دەیزانی کە نابێ هیچ گومانێکی بەنیاز خراپی دەوڵەتی تاران هەبێ. بەڵام چونکە خۆی

بەرامبەر بەخەڵک بە بەرپرس دەزانی و دەیهەویست وەزعیکیوا پێک بێن کە خەڵکی کوردستان تووشی دەربەدەری وماڵوێرانی و کوشتار نەبێن. ئەو خۆبەدەستەوەدانی بەرپوبەرانی حیزبی دیموکراتی بە باش نەزانی، بەڵام پێی گوتن ئێوە برۆن من لەگەڵ خەڵکی مەهاباد دەمێنمەوە. هەروەها لە دوا چاوپێکەوتنی دا لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانیدا رۆژی ٢٥ی سەرماوەز داوا لە پێشەوا دەکات لەگەڵ بارزانیەکاندا بچن .. بەڵام پێشەوا قازی وەڵامەکەی هەر ئەوە بوو کە گوتی:

«دەزانم ژیانم دەکەوێتە مەترسیەوە بەڵام قەیدی نییە، خەڵک بەجێ ناهێڵم» .. بەڵام ناوبراو لە دواییدا دەڵێ:«لە ناکامی لێکدانەوەی ئەو هەڵە و مەرجە نالەبارەدا بوو کە قازی محەممەد تووشی هەڵەیەکی مێژوویی بوو کە رۆژی ٢٥ی سەرماوەز لەگەڵ حاجی بابا شێخ و سەیفی قازی بە پیری سەرتیپ هومایوونەوە چوون بۆ میاندواو.. » (چل ساڵ خەبات .. ل١١٦).

هەروەها دەڵێن قازی محەممەد لە کاتی خواحافیزیدا لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی وتوویەتی:«من خۆم دەکەمە فیدای خەڵکی و هیچ کات وەک پێشەوەری و سەرانی ئازەربایجان ناکەم تا وڵاتەکەم شەڵاڵی خوێن بێ و خەڵکی بە هەزاران بە کوشت بچن.(وەرگێر).

٣٤- لە ٩ی بەفرانبار(٣٠ی دیسەمبەری ١٩٤٦ز)دا بووە.(وەرگێر).

٣٥- وێرای نووسەر، ئەم بابەتانەی سەرەوە لەگەڵ راوبۆچوونی چەند کەسێک لە لێکۆڵەرەوانی مێژووی مەهاباددا بەراورد کراون.

٣٦- لە بارەی هەڵوێستی جوامێرانەی قازی محەممەد زۆر شت دەگێرنەوە کە ئازایانە بەرپەرچی هەموو تۆمەتەکانی داوەتەوە و ئەو دەوڵەت و دادگای خستۆتە ژێر پرسیار و دادگایی کردوون و وتوویەتی کە ئەم رووداوانە هەمووی

ئەنجامی سیاسەتی داگیرکەرانەی دەوڵەتە و نیوە خۆتان باسای بەرەتیتان لە ژێر پێ ناوە، هەروا وتوویەتی من لە مێژە خۆم بۆ ئەوە ئامادە کردووە سەربەرزانە پێشوازی لە مردن بکەم لەپێناو ئازادی میللەتەکەمدا...

هەوڵنێریکی‌تر بەناوی (کیومەرس سالحی) دەڵێ:«من لە زۆربەی دادگا سەربازی و مەیدانیەکاندا وەک پەیامنێریک بەشداریم کردووە، بەڵام هیچ کەسێکم بە قەد قازی محەممەد بە جەرگ و ئازا نەدیوە، لە کاتی دادگایی کردندا نەیدەزانی ترس چی‌یە زۆر بێ‌باکانە قسەی دەکرد و وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە».

ئەم ئازایەتی و چاونەترسی و چوون بەپیر پەتی سێدارەوە سەرنجی زۆر لەو ئەفسەرانەی سوپا و پەیامنێرەکانی راکێشاوە، بۆیەش لە کاتی لەسێدارەدانی‌دا ئامادە بوو بە بێ چاو بەستن بچێتە بەر سێدارە .. بە پێی زۆر بەڵگەنامەش ئەمریکا و ئینگلیز لە پشتی دادگاکەوە بوونە و لە زیندانیشا هەوڵیان‌داوە پەشیمانی بکەنەوە ..

ئەوە ماوە بڵێم کە دوای ئەم بڕیارە سەربازی‌یە هەمموو جموجوولێکی کوردانە قەدەغە کرا و ژمارەیەکی‌تریش ئیعدام کران و زمانی کوردی و چاپەمەنیەکان و چالاکی‌یە رۆشنبیری و سیاسیەکان یاساغ کران و زمانی فارسی کرایەوە بە زمانی رەسمی لە کوردستان و قوتابخانە کوردیەکان داخران و تێکدران، و کتێبە کوردیەکان سوتێنران، وە خەڵکی بە گشتی کەوتنە ناو بارودۆخێکی ئاڵۆز و پڕ لە ترس و لەرزەوە ... (وەرگێر).

٣٧- قەوام سەڵتەنە سەرۆک وەزیری ئەو کاتەی ئێران بە سەرنجدان لە بارودۆخی ئاڵۆز و ناثارامی مەهاباد، عەلی یار سەرۆکی عەشیرەتی دەبۆکری

مەهاباد وەک فەرماندەیەکی خاوەن دەسەڵاتی تەواو(تام الاختیار)ی خۆی دیاری دەکات، ئەنانەت دەسەڵاتی ئەوەشی پێ ئەدات کە پلەی لەشکریی بە عەشایری ژێر دەستی خۆی ببەخشێت، بە دەربڕینێکی دیکە قەوام سەڵتەنە لە بەرامبەر جەرەیانی قازی محەممەددا، پشتیوانی لە جەرەیانی عەشایری ناوچەکە دەکرد.
بڕوانە/ یادداشتەکانی دەستنووسی عومەر عەلیار/ هەمان سەرچاوە.

٣٨- ئیحسان نەبەوی لە کتێبی(کژ راهە)لە لێکدانەوە و توێژینەوەی خۆیدا لەمەڕ ڕووداوەکانی ئازەربایجان و کوردستان، دەڵێت:

« ... بە کورتی، خەریک بوو کە بزووتنەوەی میللی لە ئازەربایجان و کوردستان(مەهاباد) سەربگری و بەو شێوەیە هێزێک(دەسەڵاتێک)لە باکوور پەیدا ببێت کە بتوانی تاران بخاتە ژێر تەئسیر و کاریگەری خۆیەوە ...» بڕوانە لاپەرە٦٦.

دیسان هەرئیحسان تەبەری بەم شێوەیە درێژەی پێ ئەدات و دەڵێ:

« ... جەعفەر باقرۆف(خاوەن و سەرپەرشتیاری پرۆژەی شۆڕشی میللی لە کوردستان و ئازەربایجان) سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی شۆرەوی، کاریگەرییان لەسەر(بن‌ریا) هەبووە. باقرۆف خوازیاری خستنە ژێر کۆنترۆڵی ئازەربایجانی ئێران بوو، وە بە ئازەربایجانی باشووری لەقەڵەم ئەدا، و جاریکیان وتبووی:

ئەگەر پێنج ملیۆن ئازەربایجانیی باشوور بخرێتە سەر سێ ملیۆن ئازەربایجانیی باکوورییەوە، ئەو کاتە ئێمە دەبینە خاوەنی کۆمارێکی هەشت ملیۆنی و پلە و پایە و بەشداری من(باقرۆف) لەهێزلیت بۆرۆ(مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت)دا سووکەرە.

بن‌ریا وەزیری ناسایشی ستالین، کە لە ئەسڵدا زۆر لە باقرۆف مەمنوون و سوپاسگوزار بوو- لە ئەنجامی ناساندنی بن‌ریا بە ستالین لە سەرەتای دەستبەکار بوونیەوە- لەو کارەدا دەستی هەبوو، چونکە بوونی باقرۆف لە پۆلین بۆرۆ لە دەستەبەندی ئەو هەیئەتە سیاسیەدا، بیگومان بە قازانج و سوودی ئەو تەواو دەبوو. بەڵام وانەزانین کە ستالین بە قسەی بن‌ریا و باقرۆفی دەکرد، نەخێر، بەڵکو رەفتار و هەڵسوکەوتی ئەو بەپێی بەرژەوەندی کات بوو، هەر وەختە چی بخوراستایە ئەوەی دەکرد.

بۆیە دەبینین کە هەر ئەوەندە بارودۆخ گۆڕا، ئیتر بەدوادا چوونی نەخشەی نازەربایجانیش بوو بەشتێکی مەحاڵ و ستالین پشتی لە خواستەکانی باقرۆف کرد و قسەی(مۆلۆتۆف) وەزیری دەرەوەی لە پێشتر دانا کە ناحەزی بن‌ریا و باقرۆف بووە.

وە بەپێی کتیبی ئەنگلتۆن، ئەفسەرە رووسەکان لە ناوچەکەدا بەم شیوەیە بوون: ژەنەراڵ سەلیم ئاتاکشیۆف کە بەدرێژایی ماوەی دەسەڵات و نفووزی رووسەکان لە باکووری ئیراندا بەرزترین پلە و پایەی سیاسی هەبووە، وە سەلاحەددین کازمۆف ناسراو بەئاکاک ئاغا بەرپرسی ناوچەی مەهاباد و ورمێ ... ئەمانە بار و دۆخە سیاسیەکەیان خستبووە ژێر چاودێری خۆیانەوە و رۆڵی پێوەند و میانگیر(رابط)یان ئەبینی لە نیوان سەرکۆماری نازەربایجانی سۆڤیەت و حیزبە دیموکراتەکانی نازەربایجان و کوردستاندا.

٣٩- بەپێی بڕیارێک کە لە کۆتایی وت‌وویژەکانی سەرۆک وەزیرانی ئیران و سۆڤیەت لە مۆسکۆدرا، راسپێردرا کە ئەو وت‌وویژانە لە تاران درێژەیان پێ بدریت، ئەوە بوو لە کاتژمێر سێ‌ونیوی دوانیوە شەوی پێنج‌شەممە ١٥ی

خاکەلێوەی ١٣٢٤ی هەتاوی(راستیەکەی ١٣٢٥ی هەتاوی-وەرگێر)بەرامبەر(٤ی نیسانی ١٩٤٦ز)لە کۆشکی وەزارەتی دەرەوەدا، وتووێژەکان لە نێوان ئێران و سۆڤیەت بە مۆر کردنی ڕێککەوتنامەیەک لە نێوان قەوام سەرۆک وەزیر و سادچیکۆف بالۆیزی نوێی سۆڤیەت لە ئێران بەم شێوەیەی خوارەوە کۆتایی پێ هات:

١- هێزەکانی سوپای سوور لە مێژووی ٤ی خاکەلێوەی ١٣٢٥بەرامبەر بە ڕۆژی یەکشەممە(٢٤ی ئازاری١٩٤٦ز)بەوە لە ماوەی مانگ و نیوێکدا هەموو خاکی ئێران چۆڵ بکات.

٢- ڕێککەوتنامەی پێکهێنانی کۆمپانیایەکی هاوبەشی نەوتی ئێران و سۆڤیەت لە ٢٤ی مارس-ئازارەوە تا ماوەی حەوت مانگی‌تر بۆ دەنگ لەسەردان و پەسەند کردنی دەدرێتە ئەنجومەنی پازدەی ئێرانی(پەرلەمان).

٣- سەبارەت بە ئازەربایجان، چونکە پێوەندی بە کاروباری ناوخۆیی ئێرانەوە هەیە، هەوڵێکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی بە پێی یاسا و دەستووره باوەکانی وڵات و بەگیانێکی خێرخوازیەوە سەبارەت بە خەڵکی ئازەربایجان، لە نێوان دەوڵەت و خەڵکی ئازەربایجان دەدرێت و چارەسەر دەکرێت. (لاپەڕە١٣١/ کتێبی ئەنگلتۆن، هەمان سەرچاوە)

**تێبینی وەرگێر:** ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە کە کوردستان وەک بەشێک لە ئازەربایجان حسابی بۆ کراوە و کێشەکەی بچووک کراوەتەوە لە کەمایەتیەکی نێو ئێرانەوە بۆ کەمایەتیەک لە نێو ئازەربایجان و کێشەی کورد پشت‌گوێ خراوە و تەنها بە وشەیەکیش باسی لێوە نەکراوە ...!

## ٤٠- لاپاسیکی گرنگ:

(له وەرگێڕەوە)

سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕووخانی کۆماری مەهاباد:

تەمەنی کۆماری کوردستان تەمەنێکی کەموکورت بوو کە تەنها ۱۱ مانگ بوو، کە ئەو ماوەیە بۆ هەر دەسەڵاتێکی سیاسی زۆر کەمە و دەرفەتی جێبەجێ کردن و ڕاپەڕاندنی ئەو بەرنامە و پرۆژانەی لە خەیاڵی دابە بۆی مەیسەر نابێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شت ئەنجامدرا و خەڵکی بە گشتی هەستی بە ئازادی و ئارامی دەکرد و دزی و بەرتیل و بەرتیلکاری قەدەغە بوو، کوشت و بڕین کەم بوو بەڵکو هەر نەبوو تەنانەت یەک حاڵەتی کوشتن لە ماوەی ئەو ۱۱مانگەدا تۆمارکراوە، لە بواری سەربازی و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و خوێندن و ... هتد...دا هەنگاوی باش نرا. بەڵام حەیف کۆمارەکە ڕووخاو تۆماری پێچرایەوە و چووە ناو لاپەڕەکانی مێژوومەوە، پرسیار ئەوەیە بۆچی کۆمار ڕووخاو بەو ئاسانی‌یە ئاش بەتاڵی پێ‌کرا ..؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئاماژە بە چەند خاڵێک دەکەین پاشان سەرەکی‌ترینیان دەستنیشان دەکەین:

الف - هۆکاری ناوەکی:

۱-نەبوونی ئەجرووبەیەکی هاوشێوەی خۆی لە کوردستان و کەم ئەزموونی سەرانی سیاسی کۆماری کوردستان و حیزبی دیموکرات، کەوای کرد لە ڕووداوەکان دوا بکەون و خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنێکی قووڵ و گونجاویان بۆ هارکێشە و پێشهاتەکان نەبێت ..

۲- هێزی پێشمەرگە و سوپای کۆماری کوردستان، زیاتر هێزێکی عەشایەری و عەشیرەتی بوو و سەرۆک عەشیرەتەکان فەرماندەیی‌یان دەکرد و بە

قسەی ئەوانیش دەکرا لە بڕیاری جەنگ و ناجەنگدا، وە سەرکردایەتی کۆمار ئەو کاریگەریەی نەبوو، جگە لەمەش ئەفسەری کەم تیابوو سەرۆک هـۆزەکـانیش هەریەکە و زیاتر لە بەرژەوەندی هۆز و عەشیرەتەکەی خۆیدا بوو و یەکدەنگ نەبوون و رکابەری زۆر لە نێوانیاندا بەدی ئەکرا..

٣- هۆکاریکی‌تر وەک خاڵی لاوازی سوپای کۆمار بریتی بـوو لـە نـەبـوونی دیسیپلینی جەنگی پێویست لە نێو هێزی چەکداردا و نەبوونی ئەزموونی شـەڕ و مەشقی سەربازی تەنها بارزانیەکان کە لە کوردستانی عیـراق شـەڕیـان بینیـبوو، باقی‌تر کەم ئەزموون بوون و زۆربەیان شەڕ و شۆڕیان نەبینیبوو.

٤- نایەرابەری هێزەکانی دەوڵەتی ئێران و سوپای کۆمار،چ لە ڕووی ژمارە و چ لە ڕووی چەکوچۆڵ و کەرەسـەی جـەنگی و خۆراکیشەوە سـوپای ئێـران لەپێشتر بوو و سوپای دەوڵەتیک بوو خاوەنی تاقی‌کردنەوە و مەشقی سەربـازی و دیسیپلین و خاوەن ئەفسـەر و فەرماندەی بەتوانا و پلانی جەنگی بوو..

٥-بەرگری نەکردن لە کۆمـار و خۆدانـە دەسـت تـەمـری واقیـع لـە لایـەن لەشکری کۆمار و نەبوونی بڕیار و ئەزموجەزمـی شـەڕ تـا دوا تنـۆکی خـوێن و زیاتر پشتئەستوور بوون بە وادە و بەڵـینەکـانی دەرەوە(سۆڤـیەت و هـەنـدێکی قەوام و دەوڵەتەکەی).

٦- زۆربەی سوپای کۆمار سوارە بوون تەنیا بارزانیەکان نەبن کە پیادەبوون، چەکی پێشکەوتوویان پێ نەبوو یاخود پێنەدرا بوو کە بەرگری پێ لە خۆ بکەن و چەکەکان زیاتر چەکی تەقلیدی بوون..

٧- زۆربەی زۆری کوردسـتان لـە دەسـتی کۆمـاردا نـەبـوو، تـەنهـا ١/٣ی کوردستانی ئێران لە دەستی کۆماردا بوو، بەشی خوارووی کوردستان لە سەقـزەوە بەرەو خوارتر تا کرماشان لە دەسـتی دەوڵـەتـی نـاوەنـدیدا بـوو، بۆیـە بـڕیاری

سەرکردایەتی کۆمار و حیزبی دیموکرات ئەوە بوو کە ناوچەکانی سنە و کرماشانیش رزگار بکەن، چونکە حکومەتی ئێران ئەو مۆڵگە و پێگە سەربازیانەی لە بەرژەوەندی خۆیدا قۆستبۆوە و لەوێوە هێرش و پەلاماری دەهێنایە سەر کوردستانی ئازاد.

بەڵام لاوازی و ناتەبایی ناوخۆ و سیاسەتی هاوپەیمانەکان، یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا و بەریتانیا بوو بە رێگر لە بەردەم ئازاد کردنی ئەو بەشانەی‌تر کە دوایی هەندێک لەم رووەوە ئەدوێین.

٨-ئەمە و چەندین هۆکاری‌تر لەوانە دواکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و هوشیاری و لاوازی باری ناوخۆی حیزبی دیموکرات کە لە کۆمارەکەشا رەنگی دابۆوە، نەبوونی یەکێتی فیکری و سیاسی و کادیری لێهاتوو و کارامە، بێ سەروبەرەیی و ناتەبایی و ناکۆکی لە نێوان بەرپرسان بەتایبەت سەرۆک هۆزەکان و... هتد.

ب - هۆکاری دەرەکی:

١- رووخانی کۆماری ئازەربایجان کە هەر زوو ئاشبەتاڵیان لێکرد و رێبەرانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بۆ یەکێتی سۆڤیەت رایان کرد، یەکێک لە هۆیەکانی رووخان و تێکچوونی کۆماری کوردستان بوو، چونکە ئەو کۆمارە یەکەم هاوپەیمان بوو لەگەڵ کوردستان کە رێکەوتننامەیان لە نێواندا هەبوو و هەل و مەرجی دروست بوون و پشتیوانی دەرەوەیان یەک بوو، بۆیە کاریگەری زۆری لەسەر خەڵکی کوردستان و دڵبەزاندنیان هەبوو سەرەنجام بەرەو ئاشبەتاڵی بردن.

٢-هۆکاری هەرە سەرەکی رووخانی کۆماری کوردستان-وەک هەموو شۆرش و راپەرینەکانی تر- هۆکاری دەرەکی پەیوەست بە دەوڵەتە ئیمپریالیست و زلهێزەکان بوو، کەلە دەسەلاتی حیزبی دیموکرات و خەڵکی کوردستان بە گشتی بەدەر بوو.

گومان لەوەدانییە کەیەکێتی سۆڤیەت رۆڵێکی گرنگیان لەهاندانی کوردەکانی ئێراندا هەبوو بۆ پێکهێنانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد و بەڵێنی پشتگیری و پاڵپشتی کردنیان پێدان و پاشانیش لەبەرامبەر تەماحی نەوت (کە شوکر دوایی دەستیشی نەکەوت!) بەتاقی تەنیا بەجێیان هێشتن و دەوڵەتی ئێران توانی بە ئاسانی لە ناویان بەرێت و کۆمارەکەیان برووخێنێ بۆیە دەتوانین بڵێین کە پیلانێکی نێودەوڵەتی بوو.

لە لایەک دەوڵەتەئیمپریالیزمەکانی ئەمریکا و ئینگلیز زۆر بە توندی و جددییەوە پشتیوانیان لە دەوڵەتی ئێران دەکرد و دژی بەرەوپێش چوونی بزاڤی رزگاریخوازی بوون لە کوردستان و لەهەموو ئێران و بەڵکو لە ناوچەکەش، دروستبوونی کۆماری کوردستانیشیان دژبە بەرژەوەندی خۆیان لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەزانی بە تایبەت مەسەلەی نەوت بۆ ئەوان زۆر گرنگ بوو کە نەوتی کەرکوکیش لە کوردستانی عیراق دەچووە گیرفانی ئینگلیز و ئەمریکاش بە هەمان شێوە ترسیان لەوە هەبوو کە ئەم کۆمارە کوردییە ببێتە نموونەیەک بۆ کوردەکانی عیراق و بەرژەوەندیە سیاسی و ئابوورییەکانیان بکەوێتە مەترسییەوە، دیارە ئەمە بە نیسبەت کوردستانی تورکیاش هەر راست بوو. لە بەرامبەر ئەو یارمەتی و پشتیوانییەی ئەمریکا و بەریتانیا بۆ ئێران، سۆڤیەتیەکان-وەک لیان چاوەڕوان دەکرا- پشتیوانیان لە کۆماری کوردستان نەکرد.

بۆ پشتیوانی جددی لە ئێران باڵیۆزی ئەمریکا(جۆرج ئالین) لەگەڵ ڕەزم ئارا بۆ بەڕێوەبردنی شەڕ دژی بارزانیەکان هاتبوو بۆ کوردستان و باڵیۆزخانەکەشیان پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ زۆر سەرۆک عەشیرەتی کورد دامەزراند بوو(چل ساڵ خەبات، قاسملۆ ل ١٥٣ سەرچاوەی پێشوو). ڕۆژنامەی (ئازادی) کە لەو کاتەدا لە بەغدا بە زمانی کوردی دەردەچوو لەبارەی پشتگیری کردنی ئەمریکا و ئینگلیز لە دادگایی کردنی قازی محەممەددا، نووسیووی:

«ئیستیعماری ئینگلیز و ئەمریکا لە بوونی قازی محەممەد و هاوڕێکانیدا دوژمنی هەرەسەرسەختی خۆیان دەدی، ئومێدیان هەبوو کە بەجۆرێکیاندا بێنن و لە بەندیخانەشدا نوێنەریان چوون لەگەڵیان دوان بۆ ئەوەی بتوانن بۆ لای خۆیان ڕایان بکێشن، بەڵام هیچ کات سەرکەوتوو نەبوون ...»(جەلیل گادانی/ ڕۆژنامەی کوردستان/ ژ٣٠٧).

دواتریش ڕۆژنامەی (ئازەربایجان) لە باکۆ نووسیووی قازی محەممەد بە نوێنەری ئەمریکا(جۆرج ئالین)ی وتبوو، گەلی کورد چاوەڕوانی هیچ چاکەیەکی لە وڵاتی ئیستیعماری نییە»(هەمان سەرچاوە).

هەروەها د.قاسملۆ دەڵێ:

«... لە ئاکامدا پاش پێداگرتنی ئەمریکییەکان کە پێیان خۆش بوو ئیسپات بکەن کەسێک دژی سیاسەتی ئەمریکا بجووڵێتەوە و لەوەش زیاتر لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتی دۆستایەتی بکات لە قامووسی ئەواندا سزای هەر کوشتنە...»(چل ساڵ ... هەمان سەرچاوە ل١٢٢).

بەڵێ قازی و هاوڕێکانی باجی دۆستایەتییان لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا دلو ئەمەش هەڵوێستی سۆڤیەت بوو بەرامبەریان!!

بەرلەستی شۆڕشگێرانی ئۆکتۆبەر وەرەقەی کوردیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان و فراوانخوازی دەسەڵاتیان بەکارهێنا. گرنگیدانیشیان لە سەرەتاوە بە کێشەی کورد و کۆماری مەهاباد هەر لەو ڕووەوە بوو، بەڵام کەزانیان ئیتر قازانجی زیاتر لە شوێنیترە و کوردستان بیری ئەوانی تیادا سەوز نابێت فرۆشتیان و پشتیان تێکرد.

شای ئێران لە یادداشتەکانی خۆیدا ئەوەی تۆمار کردووە کە خودی ستالین لەمبیز بوو پلانی دارشتبوو بۆ کۆتایی هێنان بە کۆماری مەهاباد و ڕووخاندنی(بڕوانە کتێبی القضیە الکردیە و المومرات الدولیە/عمر عبدالعزیز ل٦٢).

زۆریش لە هاوچەرخانی قازی محەممەد باسیان لەوە کردووە کە ناوبراو لە کاتی گیرانیدا و لە زیندانا جەختی لەسەر فرت و فێڵ و پلانەکانی سۆڤیەت کردۆتەوە و پەشیمانی خۆی دەربڕیوە کە متمانە و باوەڕی خۆی پێداون و وتوویە ئیمەیان فریو دا و با گەلی کورد فریوی ئەوان نەخوات و چەک دانەنێن و بۆ ڕزگاری و ئازاد بوون خەباتی خۆی درێژە پێبدات.

ئەگەر ڕووسەکان ڕاستیان کردبایە تا سەر پشتی کۆماری کوردستانیان دەگرت و لە رووی سیاسی و سەربازییەوە ڕێنماییان دەکرد، بەڵام ئەوان ئیتر بڕیاری خۆیان دابوو و ئیشیان پێ ی نەمابوو، تەنانەت ڕێگرییان لە هەنگاوە ئیجابیەکانی کۆماریش دەکرد، بۆ نموونە کاتێک سوپای کۆمار لە دوای شەڕی (مامەشا) ویستی هێرش بکاتە سەر هێزەکانی ئێران لە ناوچەی سەقز، کەهەم ورەیان بەهێز و ژمارەشیان زۆر بوو، هیوادار بوون کە سەنەش ڕزگار بکەن، کەچی ڕووسە کۆمۆنیستەکان نەیانهێشت بەرەو ئەو سەرکەوتنە بڕۆن، ئەوە بوو ڕۆژی ٣٠ی جۆزەردانی ١٣٢٥ی هەتاوی(٢٠ی حوزەیرانی ١٩٤٦ز) هاشموف قونسوول(نوێنەر)ی ڕووس لە ورمێ لە گوندی (سەرا) چاوی بە قازی محەممەد

کەوت و داوای لێکرد کە هێرش نەکاتە سەر سوپای ئێران و سۆڤیەت ئەم شەرەی پێ باش نیە و ئێستر سوپای سۆڤیەت ناتوانێ یارمەتی هێزی کۆمار بدات، کە ئەم بڕیار و پێشنهاتە نوێیەش کاریگەری زۆری لەسەر چارەنووس و دوارۆژی کۆمار دانا.

قازی محەممەدیش وای دەزانی کە هەرگیز ستالین و باقرۆف پشتی بەرنادەن و بەڵێنەکانیان دەبەنەسەر و ئەو وادە و بەڵێنانەی لە کاتی گفتوگۆکانیدا و لە دەمی چاوپێکەتنەکانیدا بە قازی و کۆماریان داوە، پێیانەوە پابەند دەبن و یارمەتی نەدەن، ئەمەش بۆخۆی کەم ئەزموونی و ئینەگەیشتنی تەویانی لە پێوەرەکانی سیاسەت دەگەیاند کە تەنها لە سەربنەمای بەرژەوەندی هەمیشەیی دەڕوات(ئیستاشی لەگەڵا بێت!).

ئێستر ئەوە بوو بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری وای خواست و شۆڕەوی خاوەن جەمسەر(!!) و پشتوپەنای جوتیار و کرێکار و چینی چەوساوە(!!) لەگەڵ ئێران رێککەوت و بڕیاری کشانەوە لەو وڵاتە و وازهێنان لە کۆماری کوردستان و (ئازەربایجانیشی)دا و لە مانگی نوڤەمبەری ١٩٤٦ز سوپای سوور لە ئێران دەرچوو، دوابەدوای ئەم کشانەوەیە لەشکری ئێران بەناوی هەڵبژاردنی ئازادەوە بەرەو کوردستان و ئازەربایجان کەوتە رێ، گوایە تا سوپا لەو دوو ناوچەیە جێگیر نەبێ هەڵبژاردن بە ئازادی ئەنجام نادرێ، بەڵێن سوپای ئێران هات و سۆڤیەتیش نەیانهێشت پەلاماری بدرێت و ئەمریکاش پشتگیری لە هاتنەکەی کرد، ئەمریکا لەسەر زاری باڵیۆزی خۆی لە تاران(جۆرج ئالین)ەوە بەم شێوەیە پشتیوانی خۆی بۆ قەوام دەربڕی:

« ئەوەکە دەوڵەتی ئێران ڕایگەیاندووە کە دەیەوێت هێزی ئەمنیەتی بۆ هەموو بەشەکانی ئێران بنێرێ ... بڕیارێکی تەبیعی و بەجێ یە» (چل ساڵ خەبات لەسەرچاوەی پێشوو/ ل١٠٥).

نوێنەری سۆڤیەتیش لە نەتەوە یەکگرتووەکان- کە نووسەر ئاماژەی پێداوە- ئەو مەسەلەیەی بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی ئێران لە قەڵەم داو گوایە ئەوانیش مافی دەست وەردان لە کێشە ناوخۆییەکانی وڵاتانیان نییە!!

وەک بڵێی دەستیان لە کێشەی هیچ وڵاتێکیتر و کاروباری هیچ دەوڵەتێکیتر وەرنەدابێت، وەک بڵێی دەیان ساڵ دەستیان نەخستبێتە ناو ئەفغانستانەوە و تورکستانی ڕۆژئاوایان وێران نەکردبێت و دەیان کێشە و کارەساتیان نەنابێتەوە لە چەندین وڵات و لە ناو چەندەها گەلی هەژار و بندەرەتان لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا هەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە تا ئێستا!!؟

مەگەر هەر لە سۆڤیەت و لە بەشی کوردستانی ئەوێدا چییان نەکرد بە کوردەکان و بەسەر ئەرمینیا و ئازەربایجاندا بەشیان نەکردن و چەندەهایان ڕووبەڕووی ئازار و ئەشکەنجەدان و بێبەش کردن لە مافی ڕۆشنبیری و سیاسی و ...هتد نەبوونەوە لە سەر دەستی ستالین و دەسەڵاتدارانیتری سۆڤیەت(ڕووسیا) و گزری بەکۆمەڵیان بۆ دروست نەکردن...؟!

بەهەر حاڵ ئەم ئەزموونەش(کۆماری کوردستان) بە پیلانێکی ئەگریسی نێو دەوڵەتی لەنێو چوو و زیندە بەچاڵ کرا! ئەبوایە کۆماری کوردستان زیاتر پشتی بە فاکتەری ناوەکی و هێزی پێشمەرگە ببەستایە و بەرگری لە خۆی کردبا ئەنجامەکەی هەرچی ببوایە و چاوەڕوانی هێزی دەرەکی و وادە و بەڵێنە فریودەرەکانیان نەبوایە، بەڵام ئەمە مێژووە و ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا و ئێستا پێویستە کورد وانەی هوشیاری لێ وەربگرێت و هەڵەکان دووبارە نەکاتەوە ..

بۆ ئەم لاپەڕە سوودم وەرگرتووە لە:

١- کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، ولید حمدی/وەرگێرانی محەممەد نوری تۆفیق/بەشی سێیەم
٢- چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی/عبدالرحمن قاسملو
٣- کردها ویک بررسی تاریخی و سیاسی/ حسن ارفع
٤- رۆژنامەی کوردستان ژمارە/٣٠٧/خاکەلێوەی ١٣٨٠
٥- القضیە الکردیە والمؤامرات الدولیە/عمر عبدالعزیز هورامانی/١٩٩٣ز
٦- چەند وردە سەرچاوەیەکی تر. (وەرگێر)

۱- کژ راهه،
خـاطراتی از تـاریخ حـزب تـوده، نوشـته احسـان طبـری، انتشـارات امیرکبیر سـال ۱۳٦٦.
۲- کمیـسیون انتشارات و تبلیغات حزب دمکرات کردستان ایران
پیامهـای کنگـره شـشـم حـزب دمکـرات کردسـتان ایـران، بهمـن‌مـاه ۱۳٦۲/کمیـسیون انتشارات و تبلیغات حزب دمکـرات کردسـتان ایـران (بی‌جا): حزب دمکرات کردستان ایران/۱۳٦۳.
۳- قاسـملو، عبدالرحمن
چل سـاڵ خەبات لە پێناوی ئـازادی، عبـدالرحمن قاسـملو(بـێ‌شـوێن) حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران/۱۳٦٤.
٤- کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران
بەڵگەنامەکانی کۆنگرەی حەوتـەمـی حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران(بـێ‌شـوێن)/: کمیتـه مرکـزی حـزب دمکـرات کردسـتان ایران/آذر ۱۳۶۴.
۵- کۆمیـسیۆنی سیاسـی نیزامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران
ئۆرگـانی کۆمیـسیۆنی سیاسـی-نیزامـی(ح.د.ک.ئـا) نشـریەی ژماره/۷/سالی ۱۳٦۵.

٦- كۆمیسیۆنی سیاسی- نیزامی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئیران
ئۆرگانی كۆمیسیۆنی سیاسی نیزامی (ح.د.ك.ئـا) نشریه ی ژماره: ٦ (بی شوێن) ،شه هریوه ری ١٣٦٥.

٧- كمیته مركزی حزب دمكرات كردستان ایران
كوردستان نشریه ژماره: ٩٨ (كردستان نشریه ی شماره ٩٨) (بی جا): كمیته مركزی حزب دمكرات، شهریور ١٣٦٣.

٨- به قلم یكی از قضات حزب دمكرات
سیر بخش قضایی حزب دمكرات كردستان ایران/ به قلم یكی از قضات حزب دمكرات (بی جا، بی نا، بی تا).

٩- كمیسیون انتشارات و تبلیغات كمیته مركزی حزب دمكرات كردستان ایران
جنگ در كردستان شماره ٤ (نتیجه جنگ در كردستان در ماههای مهر، آبان، آذر ١٣٦٣) / (بی جا): كمیته مركزی حزب دمكرات، ١٣٦٣.

١٠- دفتر سیاسی پاسداران انقلاب اسلامی
كردستان، امپریالیزم و گروههای وابسته، نشریه شماره ١/ دفتر سیاسی سپاه پاسداران انقلاب اسلامی- (بی جا بی نا بی تا).

١١- یادداشتهای عمر علیار پیرامون اوضاع مهاباد در سالهای ١٣٢٠ تا ١٣٢٦.
شایانی وەبیر هێنانەوەیە كە سەرچاوەكانی سەرەوە لە كتێبخانەی پارێزگای كوردستان دەست دەكەون.

## شوێنەکان

وێنەکانی ئەم کتێبە، کۆکراوەی چاپەمەنی تەوەکولی یە

## ناوەکان

سەدری قازی — قازی محەمەد — سەیفی قازی

دانیشتوو: قازی محەمەد، ریزی یەکەم لە راستەوە ١)حاجی مستەفای داودی ٢)عەبدلی خوسرەوی ٣) ئەحمەدی ئیلاخی ٤) محەمەدە مینی موعینی ٥) وەهابی بلوریان ٦)رەحمانی ئیلخانی زادە ٧)کەریمی ئەحمەد دەین ٨) عەلی ریحانی.
... ... لە راستەوە ١) ... ٢) خوسرەوی ... ٣) سەید محەمەدی

سەرلەشکر هومایوونی

سێ ڕۆژ نان و ئەمەکی قازی خواردە و ئەمەک بە حەرام دەرچوو

هەژار و زەبیحی - سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک کاتی دەرکردنی گۆڤاری نیشتمان - تەوریز